لە پێناو گەلێکی
خاوەن بڕیاردا

# بڕیار

87

یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی
مرۆیی لە کوردستاندا!

سالٔی هەشتەم
ئەیلولی ٢٠١٥

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی





## ڕێنماییە ئاڵتوونییەکان بۆ خوێندکاران

## چۆن دەژیت؟

## تەنزی خێزانی

## هاوڕێی هەمیشەیی

## شازادەی مەملەکەتی ئەوین

No: 87

ئەیلولی 2015

**خاوەنی ئیمتیاز**

ئەندازیار:

مەسعوود تاهیر ڕۆژبەیانی

**سەرنووسەر**

د. عادل محەممەد شێخانی

sarnosar@yahoo.com

**بەڕێوەبەری نووسین**

بەرزان ئەبوبەکر

**دەستەی نووسەران**

ئەسکەندەر ڕەحیم

بێگەرد فارس

زاهیر زانا

محەممەد مێرگەیی

محەممەد هاشم

وەهاب حەسیب

یەحیا محەممەد

گوڵان حەمەئەمین

**ڕاوێژکاری یاسایی**

پارێزەر: ئازاد محێدین

**بەشی هونەریو دیزاین**

پشتیوان عبدالرحمن

**تایپ**

کەلسوم جەلال

**ناونیشانی گۆڤار**

سلێمانی: شەقامی سالم -

تەلاری جەمالی حاجی عەلی- نهۆمی چوارەم- نزیك پردی خەسرەو خاڵ

٠٧٤٨٠١١٢٧٨٧ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

هەولێر: ٠٧٥٠٥٢٥٣٠٣٥ - ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

bryarmagazine

bryarmagazin@gmail.com

چاپ: کۆمپانیای پیرەمێرد

دابەشکردن: کۆمپانیای پەیك/ 07708649210

نرخ 2500 دینار




# بڕیار

**مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی**

**ساڵی هەشتەم - ژمارە 87 - ئەیلولی 2015**










# کارگێڕی و بازاڕسازی

# چۆن دەژیت؟

یەکەم دڵۆپ

سەرنووسەر

سەرەتا هەوڵ بدە ژیانت خۆش بوێ، فێربە چۆن بژی! ژیان بەجوانی ببینەو هەمیشە دەوروبەرت بەجوانیو ڕازاوەیی ببینە، هەوڵی خۆشگوزەرانیو بەختەوەریی خۆت بدە، ئەو کارە، تەنها بەخۆت دەکرێ.

بە تاسەو خەندەو پێکەنینەوە، پێشوازی لە هەموو ڕۆژێکی نوێ بکە، سوپاسی خودای گەورە بکە لەسەر هەڵاتنی خۆر، جریوەی چۆلەکەکان، نانو چای بەیانی، تەندرووستباشیو لەشساغیت!

خۆ ئەگەر هۆکارێکت نەبینی بۆ بەختەوەریو سوپاسکردنی پەروەردگار، ئەوە مانای ئەوە نییە، کە تۆ لە نیعمەتی خودا مەحروومی، بەڵکو ئەوە خۆت ناتوانی جوانییەکان ببینیو مرۆڤێکی سوپاسگوزار بیت!

تاپەتوەکەی سەرت هەڵنەدەیتەوە، ناتوانی خەونەکانت بەڕاستی ببینیو ئاواتەکانت بێنیتە دی!

هەڵسەو چیدی دامەنیشە، کورد دەڵێ: شوان بە دانیشتن، لە مەڕەکانی دوورەکەوێتەوە!

تەنها تەماشای مرۆڤە سەرکەوتووەکان مەکە، کەس بە تەماشا نەبووە بە پاشا!

وەرە مەیدانو شان بە شانی ئەو خەڵکە کێبەرکێ بکە، بۆ گەیشتن بە ئاواتەکانت!

گرنگ ئەوەیە بزانی چۆن دەژیت، لە ژیانی خۆت ڕازیبیتو بەختەوەر بژی، گرنگ ئەوە نییە چیت هەیەو خاوەنی چیت!!

ژیان بە سادەیی بگرەو لە خۆتی ئاڵۆز مەکە، بەختەوەری لە ژیاندا، پێویستی بە کەڵەکەکردنی سەروەتو سامانی بێشومار نییە!

ماڵێکی خنجیلانە، خێزانێکی هێمن، جلوبەرگێکی پاکو بۆنخۆش، ڕێزو خۆشەویستی، زەوقی جوانو حەزکردن لە ژیان، هاوڕێ بە دڵێکی ئاوەدان بە متمانە بە خودا، بەهەشتێك درووست دەکەن، کە هەموو ملیاردێرەکانی دنیا خەونی پێوە دەبینن!!

چێژ لە هەموو چرکەساتەکانی ئەمڕۆت وەرگرەو نیگەرانی سبەی مەبە!

هەمیشە چاوەڕوانی خۆشی بکە، لەخۆڕا پرسە بۆ خەمو پەژارە دامەنێ، پێبکەنەو مەهێڵە هیچ کەسو هیچ شتێك، خۆشیت لێ تێك بدەن، دڵنیابە تێکدەرانی خۆشی، زۆر بێبایەخن!

خۆت لە بێکاریو بەتاڵیو بێبەرنامەیی بپارێزە، دەستبەتاڵی هێدی هێدی دەتکوژێ، کاتەکانت بەهەدەر دەبا، بێهیواو بێئاواتت دەکات، دەتکاتە هێلانەی خەیاڵی خراپو ئەهریمەنی!

ببەخشەو ئامانجت خزمەتکردنی خەڵكو دڵخۆشکردنیان بێت، لەم کارەشدا سوودمەندی یەکەم تۆیت، با تۆ لە بەخشینی دەوروبەرت مەحروومیش بیت!

هەرگیز ئازاری کەس مەدەو لەگەڵ کەسدا خراپ مەبە؛ چونکە خراپەکاری ژیریو دانایی لە مرۆڤ دەسەننەوەو ڕۆحی دەمرێننو بەرگی مرۆڤی لێ دادەڕنن!

هەرگیز مەترسەو سڵ لە هیچ مەترسییەك مەکەرەوە، ئەوەی خودا نەیەوێت، هەرگیز دوچارت نابن! نەنگییە بۆ مرۆڤ لە مرۆڤی وەکو خۆی بترسێ!

تەنانەت لە مردنیش مەترسە، چۆن پێشوازی لە ژیان دەکەیت، ئاواش پێشوازی لە مردن بکە، تۆ بە کارە چاکەکانت سەربەرزیی ژیانو مردن، بۆخۆت تۆمار دەکەیت!

تەنها مرۆڤە خراپو ترسنۆکەکان لە مردن دەترسن!

وا بژی مردن نەتوانێ ناوت بسڕێتەوە!

مردن نەتوانێ بتمرێنێ!

مردن بۆ مرۆڤە باشەکان تەنها پردێکە بۆ بەهەشت!

ئەو کەسە لە مردن دەترسێت، کە دۆزەخ چاوەڕێی دەکات!

با دڵت پڕبێ لە خۆشەویستی، دوور لە هەموو ڕقو کینەو ئیرەییەك، خاکیو سادەو میهرەبان بە، دڵنیابە ژیانو مردن، شانازیت پێوە دەکەن!



# کارگێڕی بە گوفتار

ئەگەر چاکەت لەگەڵ خەڵکیدا کرد، بیشارەوە،
بەڵام ئەگەر چاکەت لەگەڵ کرا، باسی بکە!

**پەندێکی عەرەبی**

کوڕی شیرینم، ئەو کاتەی لە سکی دایکت بەربوویتەوە، پشتت لە دونیا کردو ڕووت لە ئاخیرەت کرد، کەواتە: تۆ لەوەی کە ڕووت تێکردووە، نەک لەوەی پشتت تێکردووە.

**لوقمانی حەکیم**

دامودەزگاو دامەزراوەکان تێکدەچن‌و خراپ دەبن،
ئەگەر بنەماو بناغەیان لەسەر ڕەوشت‌و ئاکاری بەرز نەبێت.

**ناپلیۆن**

مرۆڤی ڕەوشتبەرز.. ڕاستگۆیە، مرۆڤی توندوتیژ.. لاوازە، مرۆڤی ڕەسەن.. خانەدانە، مرۆڤی پشوودرێژ.. حەکیمە، مرۆڤی شەریف، داوێنپاکە.

**ئیبراهیم نیزام**

کارەکانمان بە خۆزگەخواستن جێبەجێ نابن، بەڵکو بە ویست‌و ئیرادەو وورەی بەرز دەتوانین، نەک کارەکان جێبەجێ بکەین، بەڵکو دەتوانین موعجیزە دروست بکەین.

**پەندێکی ئەمریکی**



# لە جەنگی ژیاندا هەستت بەهێزترین چەکە!

دوای زەمینلەرزە گەورەکەی "لۆس ئەنجلس" بێژەری یەکێك لە کەناڵە تەلەفزیۆنییەکان، ڕاوبۆچوونی خەڵکی وەردەگرت سەبارەت بە قەیرانی پاڵەپەستۆی هاتوچۆی ئۆتۆمبێلو گیرانی ڕێگاکان.

سەرەتا لە جامی ئۆتۆمبێلێکی داو سەبارەت بە هەستی بەرامبەر ئەم بارودۆخە پرسیاری لێکرد!

ئەویش بە دەنگیکی بەرزو زمانێکی تووڕەوە لە وەڵامدا گوتی: من ڕقم لەم شارەیە، ئەمە شاری بەڵاو نەهامەتییە، جارێك ئاگرکەوتنەوەو جارێك لافاوو ئێستاش زەمینلەرزە، لە سەرووی هەموو ئەمانەشەوە، ئێستا من لەکارەکەم دوا دەکەوم!

بێژەرەکە بە خێرایی لێی دوور کەوتەوەو ترسا کە زێتر تووشی هەڵچوون بێتو لەوانەیە تووشی کێشەیەکیش ببێت لەگەڵیدا!

ئەوی بەجێهێشتو لە جامی ئۆتۆمبێلی دوای ئەوی داو هەمان پرسیاری ئاڕاستە کرد! ئەویش لە وەڵامدا گوتی:

یەکەم: سوپاسی خودا دەکەم کە من زیندووەو نەمردووم.

دووەم: ئەم زەمینلەرزەیە خزمەتێکی پێشکەش کردم، کە بەدرێژایی ژیانم لەیادم ناچێت، ئەویش ئەوەیەکە تۆکمەیی‌و بەهێزی بناغەی خانووەکەمی بۆ تاقی کردمەوە.

سێیەم: ئەم قەرەباڵغییەش هەلی فێربوونی زمانی ئیسپانی بۆ ڕەخساندم لەڕێگای کاسێتەوە، هەربۆیە بە قاوەیەکی نایاب خۆم بۆ ئەم پاڵەپەستۆیە هاتوچۆیە ئامادە کردووە!

لەم چیرۆکەوە فێردەبین:

١- ژیان جەنگەو ئێمەش جەنگاوەر، ئاساییە لە ژیاندا ڕووداوو کارەساتی ناخۆش ڕوو بدەن.

٢- لەم چیرۆکەدا یەك ڕووداوو دوو پێشوازی جیاوازو ئەنجامی جیاواز دەبینین.

٣- چەکی ڕووبەڕووبوونەوە لە بەرامبەر گرفتو کێشەکانی ژیانا، چۆنێتیی قبووڵکردنو تەماشاکردنو مامەڵەکردنە لەگەڵیاندا.

٤- نابێت مرۆڤ تەسلیم بە ڕووداوە ناخۆش‌و گرفتە سەختەکان ببێت، بەڵکو هەمیشە دەبێت لە گۆشەیەکی پڕ لە هیواوە، تەماشایان بکات.

٥- هەمیشە ڕووداوەکان دوو دیویان هەیە، ناکرێ تەنها ڕووە ناشیرینەکەی ببینین؛ چونکە لەو دیوەی ئەوەوە ڕوویەکی جوانی هەیە!

٦- لەوانەیە ئەو کارەی تۆ پێت ناخۆشەو پێی ناڕەحەتی، زۆر خێری تۆی تێدابێت.

٧- ئاگاداری هەستت بە، سەرەتای مامەڵە لەگەڵ ڕووداوەکاندا، هەستت دیاری دەکات، بێزار مەبە، خۆڕاگر بە، خەمبار مەبە، هیچ بارودۆخێك، تاسەر بەردەوام نابێت.

# تەنها بۆ سەرکردەکان

کارەکانت، دەسەڵاتت پێدەبەخشن،
هەڵسوکەوت و ئاکاریشت، ڕێزو خۆشەویستی!

سێ سیفەت پێویستە لەسەرکردەدا هەبن:
خۆبەکەمزانین، ڕاشکاوی، ئازایەتی.

ئەو کەسەی کە هەرگیز پرسیار ناکات،
یان هەموو شتێک دەزانێت، یان هیچ نازانێت!

هیچ کەس ناتوانێت بچێتە سەر پشتت،
ئەگەر خۆت بۆی دانەنەویتەوە!

جیهان ڕێگا بۆ ئەو کەسە واڵا دەکات،
کە دەزانێت بەرەو کوێ دەڕوات!

(رالف و.امرسون)

سامان کەریم



# پلانی سەرژمێریی دانیشتوان

## بەشی دووەم

**سێیەم:** سەبارەت بە خاڵی چوارەم، مەبەستمان لەوانەشە، کە خەڵکی هەرێمی کوردستانن، بەڵام لە ئێستادا لە وڵاتێکی دەرەکی، مافی پەنابەرییان وەرگرتووەو لەوێ دەژین؛ چونکە دەبێت پێش هەموو شتێك، ئێمە بزانین ئەم سنووری جوگرافییەی کە لەسەری دەژین، ژمارەکەی چەندەو چۆن دانیشتوان بەسەر ناوچەکاندا دابەشبوون، ئەگەرنا هەر هاوڵاتیەکی هەرێم، کە لە دەرەوە دەژی، هاتەوە کوردستان، هەمان مافی خۆی وەردەگرێتەوە.

**چوارەم:** سەبارەت بە خاڵی پێنجەم، بەڕاستی حکومەت، دەبێت بڕیارێکی تەندرووست، لەبارەی قەرەجو کۆچەری نایاسایی‌و ئاوارەکان بدات؛ چونکە گەر هەمان حسابی هاوڵاتیی هەرێمیان بۆ بکات؛ ئەوا دوور نییە لە ماوەیەکی زۆر کەمدا، هەرێمی کوردستان پڕ ببێت لە ئاوارەو کۆچەری نایاسایی. بۆیە دەبێت حکومەت بڕیارێکی حەکیمانە لەبارەیانەوە بدات، کە بە بڕوای من، مافی ژیانیان هەبێت تاکو شوێنی خۆیان باش دەبێت، بەڵام چاودێریش بکرێن، بۆ هەموو کارێکی ناشایستەو هەڵەیان لێ قبووڵ نەکرێت.

### چۆن هاوڵاتیی ناوخۆ لە دەرەکی جیا بکەینەوە؟ زۆر گرنگە؟

بەم ڕێگایانە، دەتوانین هەموو ئەو کەسانەی کە دانیشتووی هەرێم نین، لەوانەی کە دانیشتووی هەرێمن، جیا بکەینەوە. لەبەرئەوەی ئەم پلانە، دروستکردنی ئامارێکە بۆ ناوخۆی هەرێم‌و دروستکردنی ناسنامەی هاوڵاتیبوونە، هەموو ئەوانی دیکە، مامەڵەی دیکەیان لەگەڵدا دەکرێت‌و دواتر ڕوونی دەکەینەوە، ئەم پلانەش سوودی سیاسیشی دەبێت.

١. **کۆبوونی خۆراك:** دەتوانین کۆبوونی خۆراك، وەك یەکەم هەنگاوی جیاکاری بەکار بهێنین.

٢. **ڕەگەزنامەو ناسنامەی باری کەسێتی.**

٣. **ناوو نازناو:** دەری دەخات گەر خەڵکی هەرێم بێت، یان نا.

٤. **ڕوخسارو جل‌وبەرگی هاوڵاتییەکە.**

٥. **زمان‌و ئاخافتن.**

٦. **پشتگیریی شوێنی نیشتەجێبوون.**

بەم ڕێگایانە، دەتوانین خەڵکی هەرێمی کوردستان لە خەڵکی دەرەوە جیا بکەینەوە؛ چونکە یەکەم شت ئێمە دەمانەوێت بزانین، ژمارەی هاوڵاتییانی هەرێمی کوردستان چەندە؟؛ چونکە کە بەرەو دەوڵەتبوون هەنگاو دەنێین، یەکەم شت بریتییە لە: ژمارەی دانیشتوان.

**پرسیار:** بۆچی بۆ جیاکردنەوەی هاوڵاتیی هەرێمی کوردستان لە هاوڵاتیی دەرەکی، دەبێت ئەم ڕێگایانە بگرینە بەر؟

**وەڵام:** زیاد لە هۆکارێك بوونی هەیە، یەکێك لە هۆکارەکان بریتییە لە: زانینی ژمارەی ڕاستەقینەی هاوڵاتیانی نیشتەجێی هەرێمی کوردستان، کە وەك مەتەڵی لێ هاتووە، یەکێك دەڵێت: چوار ملیۆنین، یەکێك دەڵێت: پێنج، یەکێك دەڵێت: شەش. بۆیە ڕاستییەکە ونەو کەس نایزانێت.

خاڵێکی دیکە بریتییە لەوەی کە دەبێت تۆزێك دووربین بین؛ چونکە بەهۆی سیاسەتی تەعریبی حیزبی بەعسی لەناوچوو، کەرکووك‌و زۆرێك لەو ناوچانەی کە پێیان دەگوترێت ناوچەی کێشەلەسەر، بەم شێوازە تووشی ئەم کێشانە بوینەوە لەسەری، بەوەی کە خەڵکی خواروو هاتن‌و بوون بەهاوڵاتی نیشتەجێی ناوچە کوردستانییەکان‌و ئێستا ئەوان بوونەتە هاوڵاتی نمرە یەك‌و هاوڵاتی نمرە یەك ئاوارە بووە بۆ شوێنێکی دی. بۆیە بەڕاستی گەر حکومەتی هەرێم، پێداچوونەوەیەك بەسیاسەتی خۆیدا نەکات، دوور نییە کوردستان دوچاری گرفتێکی گەورە ببێتەوە! بەناوی ئاوارەو لێقەوماوەوە، زۆرێك لە خوارووی عێراق‌و تەنانەت ئێران‌و تورکیاش نیشتەجێی هەرێم بوون، کە دواتر ڕەنگە نەچنەوە ناوچەکانی خۆیان، بەمەش وەك کەرکووکی ئێستای لێدێت، کە سەرباری ئەوەی کوردستانە، بەڵام لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراقدا، لە کۆی ١٢ کورسی ٨ بۆ کورد بوو، ئەوی دیکەی بۆ عەرەب ڕۆیشت، گەر وا بڕوات، ئەم حاڵەتە لە سێ پارێزگاکەی دیکەیش سەر دەگرێت‌و ئەوکات دەبێت بە ئەمری واقیع‌و ناتوانین هیچ بکەین.

### گرنگیی ئەم پلانە، بۆ چ مەبەستێکە؟

١. **سەرژمێریی دانیشتوان:** ئاماری دانیشتوان دەزانین چەندە بەشێوەیەکی زانستی‌و تەندرووست، کە تائێستا بەشێوەیەکی نازانستی زانیومانە، گەر ئاماری دانیشتوانیش نەزانراو بوو، چەندین کێشە بەهەڵپەسێردراوی دەمێنێتەوە.

٢. **قەرەباڵغیی دانیشتوان:** بەم پلانە دەزانین، چ ناوچەیەکی نیشتەجێبوون لەچاو دانیشتوانی گشتیدا، زۆر قەرەباڵغترەو چ

ناوچەیەکی نیشتەجێبوون قەرەباڵغی کەمترە، تاکو ڕێوشوێنی پێویست بگرینەبەر؛ بۆئەوەی دابەشبوونی دانیشتوان، بەسەر ناوچەکانی نیشتەجێبووندا یەکسان بکەین، نەك شوێنێك بەرەو قەرەباڵغی بڕواتو شوێنێك بەرەو چۆڵی بڕوات، کە دیارە ئەمانە هۆکاری خۆیان هەیە، دەبێت لەڕێگای ئەو هۆکارانەوە، چارەسەرەکان دیاری بکەین.

٣. **ڕەگەزەکانی دانیشتوان:** بەم پلانە دەزانین، ڕێژەی ڕەگەزی نێرو مێ چەندە، کە تا ئێستا ئەمە نازانین.

٤. **ڕێژەی خوێندەواری:** ئەم ڕێژەیە لەچاو نەخوێندەواریدا دەزانینو هەوڵی بنبڕکردنی نەخوێندەواری پێ دەدەین، مەگەر کەسێك خۆی بیەوێت نەخوێندەوار بێت.

٥. **نەخۆشی:** ڕێژەی هەموو جۆرەکانی نەخۆشی دەزانین، کە لە داهاتوودا بۆ پلانی تەندرووستی سوودی لێ وەردەگرینو هەوڵی بنبڕکردنی نەخۆشییەکانی پێ دەدەین.

٦. **خاوەنکارو بێکار:** ڕێژەی بێکاریو خاوەنکاری پێ دیاری دەکەین، کە زۆر گرنگە.

٧. **درۆ:** هەنگاوێکی زۆر باش دەبێت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی گەندەڵیو درۆ، کە لە داهاتوودا دەزانین بۆچی؟

٨. **ئاستی تەمەن:** بەهۆی ئەم پلانەوە، دەزانین دانیشتوان بەچ ڕێژەیەك بەسەر تەمەنەکاندا دابەش بووە؟! کە هەر ئاستی تەمەنێك گرنگیی تایبەتی خۆی هەیە، بۆ چارەسەرکردنی کێشە.

٩. **کرێنشینی:** بەهۆی ئەم پلانەوە، ڕێژەی ئەو خێزانانەی کە کرێچین دەزانینو بنەبڕی ئەم حاڵەتەی پێ دەکەین، کە ڕێگای خۆی هەیە بۆ بنەبڕکردنی ئەم حاڵەتە، نەك ئەوەی کە ئێستا ئەنجام دەدرێت بەشێوەیەکی هەڕەمەکی بۆ نەهێشتنی کرێنشینی، کە هێندەی گرفتی درووست کردووە، هێندە هۆکار نەبووە بۆ چارەسەر.

١٠. **ئامار:** کە مەبەستمان پێی ئامارێکی زانستیو ڕاستو درووستە، بۆ دیاریکردنی کێشەکانو چارەسەرکردنیان، مەبەستمان ئامارێکی چڕە، کە زۆر سوودی لێ وەردەگرین بۆ ئێستاو داهاتوو.

کەواتە: وەك دەبینین ئەم پلانە تەنها لە ڕوویەکەوە سوودی نییە، بەڵکو لە چەندین ڕووەوە، گرنگیی خۆی هەیەو چەندین کێشەی گرنگمان هەیە، وەك: نەخۆشی بۆمان دیاری دەکاتو بەهۆی پلانی تۆکمەی دیکە، بنەبڕی دەکەینو ئەم پلانە پەیوەندییەکی پتەوی هەیە، بەچەندین پلانی گرنگی دیکەوە، کە تاکو ئەم پلانە جێبەجێ نەکەین، ناتوانین ئەوانی دیکەیش جێبەجێ بکەین.

### گرنگیی ئەم پلانە، لە ئێستاو ئایندەدا:-

**لە ئێستادا:** لە ئێستادا ئەم پلانە، یەکەم هەنگاوی گرنگە؛ بۆ درووستکردنی ئامارێکی درووستو زانستی، کە لە هەر بوارێكو هەرکاتێك بمانەوێت، بۆ هەر بەشێك بێت، ئامار وەردەگرین.

**لە ئایندەدا:** سەرباری ئەوەی کە دەبینە خاوەنی ئامارێکی تەندرووست لە داهاتوودا، سوود لەم پلانە وەردەگرین؛ بۆ چارەسەرکردنی هەموو قەیرانەکانو درووستکردنی ئەو سیستەمەی کە خەونی پێوە دەبینین، لەڕێگای ئەم پلانەوە، هەروەها دارشتنی چەندین پلانی دیکەی تۆکمەو بەهێزی دیکە، بەهاوکاری ئەم پلانە گەر تەنها ڕاستگۆیانە، زانیاریی داواکراو پڕ بکەینەوە.

### چۆنێتیی جێبەجێکردنی پلانەکە:

یەکێك لە خاڵە هەرەگرنگەکان، بریتییە لە: چۆنێتیی جێبەجێکردنی ئەم پلانە، کە ئەمیش بە دوو قۆناغ دەبێت:

**قۆناغی یەکەم:** شیکردنەوەی بۆ ڕای گشتیو دەوڵەمەندکردنی بە ڕاو پێشنیارو بۆچوونەکان، ئەمەی ئێستا بەشێوەی کتێبێك ئامادەکراوە، بەشێکە لەم قۆناغە؛ چونکە ئەم پلانە، بۆ هاوڵاتییانی هەرێمی کوردستانە، دەبێت بۆچوونیان لەسەری وەربگیرێت؛ بۆ دەوڵەمەندکردنی پلانەکە، لەبەرئەوەی ناکرێت لەکاتی جێبەجێکردندا بینو شتێکمان بیر بچێت، کە گرنگ بێت. بۆیە دەبێت زۆرترین هاوڵاتی بەشدار بن، بەتایبەت ئەوانەی کە پسپۆڕییان لە بەشی ئامارو بەشی کۆمپیوتەردا هەیە؛ چونکە پەیوەندییەکی بەهێزی بەو دوو پسپۆڕییەوە هەیە.

**قۆناغی دووەم:** جێبەجێکردنی پلانەکە، لەگەڵ ئەو کەسانەی کە بۆ ئەم پلانە پسپۆڕو شارەزان؛ بۆئەوەی پلانێکی بەهێز دەربچێت، ئەم قۆناغەش، دەبێت بە چەند بەشێکەوە، کە دواتر باسیان دەکەین.

### بەرنامەی بەکارهاتوو بۆ پلانەکە:-

گرنگترین خاڵ، بریتییە لەو بەرنامەیەی کە بۆ جێبەجێکردنی ئەم پلانە بەکاری دەهێنین، مەبەستی سەرەکیمان لە بەرنامەی تەکنەلۆجییە؛ چونکە تائێستا بەشێوازێکی تەقلیدی، سەرژمێریی دانیشتوان کراوە، ئەو بەرنامانەی کە من کەمێك شارەزایم تێیدا هەیەو بۆ ئەم کارە سوودیان دەبێت بریتین لە:

١. server SQL
٢. Oracle
٣. Access Office Microsoft
٤. Basic Visual

### سوودەکانی ئەم پلانە:

هەموو پلانێك، سوودی تایبەتیی خۆی هەیە، لەبەرئەوە چەند خاڵێکی گرنگ، وەك سوودی ئەم پلانە باس دەکەین:

١. زانینی ژمارەی دانیشتوان لە هەموو ڕوویەکەوە.

٢. دامەزراندنی سیستەمێکی نوێی سەرژمێری بۆ وەرگرتنی ئامار، کە دواتر سوودی دەبێت بۆ هەموو دامەزراوەکانی دیکەی حکومەتو هەموو کایەکانی ژیان.

٣. دامەزراندنی چەندین فەرمانبەر؛ بۆ بەڕێوەبردنو بەردەوامیدان بەم پلانە، بەشێوازی گرێبەستو فەرمی، کە لەو بوارەدا کار دەکەن.

٤. چارەسەرکردنی کێشەکانی هاوڵاتی بەهۆی ئەم پلانەوە، لەبەرئەوەی ئەم پلانە، دەبێتە هۆی دیاریکردنی ئامار، بۆ هەر بەشێكو سوود لێوەرگرتنی بۆ هەرکاتێك، کە پێویست بێت.

٥. گرنگترین خاڵ، بریتییە لە: داتاو ئامار، کە دەتوانین بۆ هەر مەبەستێك، ڕێژە دەربکەینو چارەسەری هەر کێشەیەك بکەین، گەر داتاکانی هاوڵاتیان ڕاستو درووست بن؛ ئەوا لە چەند ساڵی ئایندەدا، زۆرترین کێشەی هەڵپەسێردراو، بەهۆی ئەم پلانەوە دیاری دەکەینو نایهێڵین.

### زیانەکانی ئەم پلانە:

هەر شتێك سوودی هەبێت، چەند زیانێکیشی دەبێت. لەبەرئەوە هەندێجار پلان هەیە، زیانی لە قازانجی زیاترە، با بزانین زیانەکانی ئەم پلانە چین:

١. پلانێکی وەها گرنگ، بڕە بودجەیەکی باشی دەوێت، تاکو بەئەنجام دەگات، دوای ئەنجامدانیش، چەندین فەرمانبەری بەتوانامان دەوێت بۆ بەڕێوەبردنو بەردەوامیدان بەم پلانە.

٢. کاتی دەوێت، گەر بەشێوەیەکی ڕێکوپێكو بێهەڵە، بەئەنجامی بگەیەنین، نزیکەی ٩ مانگ بۆ ساڵێکی پێویستە، بەتەواوی ئەنجامی بدەین.

٣. بەردەوامی دەوێت، تەنها جێبەجێکردن گرنگ نییە! بەڵکو بەردەوامیدانو تازەکردنەوەی زانیارییەکان، زۆر گرنگە بۆ سەرکەوتنی ئەم پلانە، کە دەبێت ڕۆژانە ئاگاداری تازەکردنەوەی زانیاری بین، بەردەوامیش بۆ هێشتنەوەی پلانەکەیە بە تۆکمەیی.

ئا: ئەسکەندەر ڕەحیم

# ئەو کارانەی نابێت لە سەرەتای دەستبەکاربوونتدا، ئەنجامیان بدەیت



**کەس دەسخەڕۆ مەکەو بەڵێنی درۆ بە کەس مەدە:-**

**یەکەم:** پێویستە باش بزانیت، دڵسۆزیو دۆستایەتی، دوو شتن بە پارەوپووڵ ناسەنرێنو ناقەبڵێنرێن.

**دووەم:** بۆئەوەی کەس خەڕۆی تۆ نەبێتو کارەکەی پەکی نەکەوێت، بەڵێنێك چییە مەیدە، هەتا لەبردنەسەری دڵنیا نەبیت.

**سێیەم:** دەبێت خەڵاتو شاباش پێدان، بەشێنەیی بەڕێوە بچێت، گەر شاباشو پاداشەکان پێویست بوون، ئەمەش پاش ئەوە دەبێت، کە بارودۆخت سەقامو جێگیر دەبێتو چاك دەزانیت، کەسێك هەیە، شایستەی شاباشو پاداشە.

**چوارەم:** پێوستە بەخشینی شاباشو پاداشت، بۆ ئەو کارانەی کارمەندەکە بێت، کە لە ڕابوردوودا پێشکەشی کردوونو بۆ ئەوانەشی لە ئایندەدا پێشکەشیان دەکات، سەرچاوە بگرێتو هەر لەو پێیە بیانبەخشیت.

**تاکڕەوو سەرسەخت مەبە..**

کاتێك بەتاکڕەویو تاکلایەنی، یان بە سەرسەختیو فیرسیچمەیی هەڵسوکەوت دەکەیت، بەس قسەی خۆت دەسەلمێنیتو دەسەپێنیت؛ ئەوا بەدەستی خۆت، کزیو لاوازیت، نەك هێزوپێزت پیشان داوە. وەختێکیش لەگەڵ کارمەندەکانتدا —وەکو کۆیلە وەها بن- بجووڵێیتەوە، دەردەکەوێت بەبێ ئەوەی پێوستت بە دوژمن هەبێتو تیماری دەردەسەریی خۆت بکەیت، کۆمەڵێك دوژمنت لەسەر هیچو خۆڕایی، بۆ خۆت سازاندووە. زۆترین شتێك لەدەستت بێتو ئەنجامی بدەیت، دەستکردنە بە گۆڕانکاریی ریشەیی، بەم حاڵەشەوە ئەمە ئەوە ناگەیەنێت، بەپێی پێویست، بەڕێوەبەرێکی سەرکەوتوویت.

هەمیشە لەبیرت بێت: پیشاندانی هێزی ڕاستەقینە، بەهێواشیو لێبڕاوانە، جێبەجێکردنی بڕیارو فەرمانەکان، مسۆگەرو دەستەبەر دەکات. گەر لە دەسەڵاتەکەشت دڵنیابوویتو متمانەت پێی هەبوو؛ ئەوا کەسانی دیکەش هەروا دەبن.

**دەست لە بادانەوەو لایەنگریو پشتیوانیی نابەجێ هەڵبگرە:-**

لە گرنگترین ڕەوشتو ئاکارەکانی بەڕێوەبەری سەرکەوتوو، ئەوەیە لەگەڵ کارمەندەکانیدا، دادگەرانە هەڵسوکەوت بکات. بۆ نموونە: هەر بۆ خۆت، کە لەگەڵ کەسێکدا کار دەکەیت، لایەنگریو پشتیوانیی کەسە نزیکەکانی دەکاتو بە لایاندا با دەداتەوە، کێ خزمترو دۆستترە، ئەوەی لا لەبەرترو لەپێشترە؛ ئەوا ورەو وزەت دادەبەزێت، بایەخدانت بە کارەکەت، بەرەو نەمان دەچێتو دواتریش بێتاقەتی دات دەگرێت، بەخۆت دەڵێیت: کە لە کۆتاییدا، دەستکەوتەکەت بۆ خۆت نەبێت، بۆ قازانجو بەرژەوەندیی دۆستێکی بەڕێوەبەر بگەڕێتەوە، لەبەرچی.. چی لە تواناتدایە دەیبەخشیت؟! شەکەتیو ڕەنجی زۆر دەکێشیت؟!

لە تایبەتییەکانی سرووشتی ئێمەی مرۆڤ ئەوەیە: بە پێداهەڵگوتنو ڕێزلێنان سەرمەست دەبین. ئێمە خۆشیمان لە هەستکردن بە ناوازەییو بایەخپێدان دێت. کاتێك ئەم شتانەمان لەدەست دەچێت، لە بەفیڕۆدانی کاتو بەخۆڕا خەرجکردنی وزەمان، لەو کارانەی ئەنجامەکەیان، نە پاداشەو نە سوپاس، دڵساردو نابەدڵ دەبین.

# هۆکاری شکستی کۆمپانیاکان

وەهاب حسیب

دروووستکردنی کۆمپانیایەکی نوێ، دواتر بوون بە پێشەنگ لە بازاڕو بواری کاردا، کارێکی ئاسان نییە، شکستی کۆمپانیاکە لە هەر ئەگەرێکی دیکە لە پێشترە، بەتایبەت لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا، کە ناجێگیریو ڕکابەری لە ئاستێکی بەرزدایە، پێویستە خاوەن کۆمپانیاکان، لە دروووستکردنی کۆمپانیادا زۆر بەئاگا بن. بەڵام گرنگترین هۆکاری شکستی کۆمپانیاکان، بریتین لە:

**١- دووبارەکردنەوەی بیرۆکەی کۆمپانیایەکی دیکە:** سەرکەوتنی کۆمپانیایەکی تازە دروووستکراو، تا ڕادەیەکی زۆر پەیوەستە بە داهێنان لە دروووستکراوەکانیدا، یان دابینکردنی خزمەتگوزارییەکانی، بە شێوازێکی جیاواز. دووبارەکردنەوەی بیرۆکەیەکی تازە بنیاتنراو، سەرەتای شکستە؛ چونکە داهێنەری بیرۆکەکە، باشتر دەتوانێت بیرۆکەکەی جێبەجێ بکاتو دواتر لە بازاڕدا ببێت بە پێشەنگ.

**٢- چاولێکەریی پڕۆژەی وڵاتی دیکە:** بەهۆی جیاوازیی ژینگە، ڕۆشنبیریو ئارەزووی بەکارهێنانەوە، پڕۆژەیەکی تازە دروووستکراوی وڵاتێك دەشێت لە وڵاتێکی دیکەدا پێویست نەبێت، هەندێك لەو کەسانەی لە بواری ئیشدا پێشەنگو سەرکارن، بەتایبەت لە وڵاتانی تازە گەشەکردوودا چاو لە وردو درشتی پڕۆژەی وڵاتانی پێشکەوتوو" بەتایبەت ئەو پڕۆژانەی تازە بناتنراون وەخۆکەوتوون" دەکەن. ئەو هەنگاوەش ئەنجامەکەی شکستە؛ چونکە ڕۆشنبیریو ئاستی بەکاربردن لە نێوان ئەو وڵاتانەدا جیاوازن لە یەکدی.

**٣- پارەدارکردنی کۆمپانیاکە لە ئاستێکی دیاریکراودا:** لەوانەیە کۆمپانیایەکی نوێ بە بڕێکی دیاریکراوەوە لە بازاڕدا دەست بە کار بکات، کاتێك دەستەو وەستان دەبیت لە پارەدارکردنی کۆمپانیاکەتدا، دواتر کۆمپانیاکەت لە بازاڕدا دەکرێتە دەرەوە ئەگەر بڕێکی پێویست پارەی بۆ دابین نەکرێت.

٤- ڕوئیایی(بینین)ی نالۆژیکیانە بۆ کۆمپانیای تازە دروووستکراو: وەك ئەوەی ڕوئیایی کۆمپانیاکە گەیشتن بێت بە کۆمپانیایەکی جیهانی لەگەڵ ئەوەی سەرمایەیەکی دیاریکراوی هەیە، ڕوئیایی نالۆژیکیانە هۆکاری زۆری تێچوونە کە لەگەڵ قەبارەی داهاتی کۆمپانیاکەدا نایەتەوە، لە کۆتاییدا هۆکاری شکستی ئەو پڕۆژەیە.

**٥- نەبوونی پلانو پلانی هەڵە:** خۆشحاڵی پێشەوایەتییە بۆ کارکردن، بەڵام لە کاتی دروووستکردنی پڕۆژەیەکی تازەدا زیادەڕەوی لە پەرۆشیدا بە بێ پلان، هۆکاری بە فیڕۆدانی کۆمپانیاکەیە، هەروەسا دەبێتە هۆی پەرشوبڵاوی ئیشەکانی کۆمپانیاکە بێئەوەی ئامانجێکی هەبێت کۆششی بۆ بکات، لەوانەیە پلانێکی نالۆجیکی هۆکاری شکستی کۆمپانیاکە بێت کە پشت بە هەڵسەنگاندنی کەسێك دەبەستێت بێئەوەی هۆکارە ڕاستییەکان لە بەرچاوبگرێت؛ چونکە پلانی کۆمپانیا تازە دامەزراوەکە لە ڕاستییەوە دوور بووە.

**٦- خەرجییەکی زۆر بۆ ئەو تێچوونانەی پێویست نین:** هەندێ لەو کۆمپانیا تازە دروووستکراوانە لەوانەیە سەرکەوتووبنو قازانجیش بکەن، هاوکات لەوانەیە خەرجییە زیادەکات قازانجەکەی بە هەدەر بداتو بودجەی کۆمپانیاکە کورت بهێنێت، وەك ئەو خەرجییە زۆرانەی بۆ بینایی کۆمپانیاکەو ئامڕازەکانی خەرج دەکرێن، یاخود ئەو خەرجییانەی بۆ پەیوەندییە گشتییەکان دابین دەکرێن.

**٧- دوورکەوتنەوە لەناوەندی کارو پشتگوێخستنی ئامۆژگارتی شارەزایان:** کەسانێك لەوانەی پێشەنگی کارن کاتێك لە کارەکانیاندا دەچنە پێش، هەست بە لە خۆبایبوون دەکەن، دوور دەکەونەوە لە ناوەندە کارو ئامۆژگارییە بەنرخەکانی شارەزایان.



# تێڕوانینێکی پێشکەوتووانە لە بواری ڕێکخستنی کاتدا



بەر لە دەستپێك: لە میانەی ئەم چەند پەیڤەوە دەمەوێت کۆمەڵێك ڕوونکردنەوە لە بارەی ڕێکخستنی کاتو خۆبەڕێوەبردنەوە پیشان بدەم؛ چونکە نزیکە لەو بیرۆکەیەوە کە دەمەوێت بیگەیەنم بە خوێنەران، ئەورۆ بەر لە هەر کاتێکی دی پێویستمان بە خۆڕێکخستنو گونجاندنی ساتەکانی ژیانە.

ئەگەر تێفکرین دەورووبەرمان زۆر بە خێرایی دەڕواتو هەنگاو هەڵدەگرێت، کاتیش چاوەڕێی کەس ناکاتو کاتیش ناتوانرێت پاشەکەوت بکرێت، یاخود هەڵبگیرێت، کەواتە: تەنها چارەسەر تێگەیشتنی درووستو گونجاندنی کاتە لەگەڵ کارو پێداویستییەکانی ژیاندا.

**سوودەکانی کاتگێڕی چین؟**

سوودەکانی فرەن، لەوانە ئەنجامەکەی دەرحاڵ هەستی پێدەکرێت، بڕێکیان ئەنجامەکەی دوور مەودایە، بۆیە پێویستە لە ئەنجامی ڕێکخستنی کاتەکانی بەردەستدا پەلە نەکرێت.

**لە سوودەکانی:**

١. بە گشتی هەست دەکەیت ژیانت بەرەو باشتر دەڕوات.

٢. بەسەربردنی کاتێکی زۆر لە تەك خانەوادەدا. سەرقاڵیو پڕکاری کارێکی بەسەر خانەوادەکاندا هێناوە گشت ساتێکو بەویستی خۆیان نەتوانن هەمیشە لە دەوری خوانێك، یان لە کاتێکی دیاریکراودا گرد ببنەوە.

٣. تەواوکردنی کاتێکی زۆر بۆ پەرەپێدان بە خود.

٤. بەدیهێنانی ئامانجو خەونەکان.

٥. کەمکردنەوەی گوشارەکان، گوشاری کارکردن، یاخود گوشارە جۆراو جۆرەکانی ژیان.

٦. بەشێوەیەکی گشتی باشترکردنی بەرهەمەکان "بەرهەمی هزری، یاخود بەرهەمی بەرجەستە بێت".

چۆن بزانم سوود لە کاتەکانم دەبینم؟ چۆن ئەو هۆکارانە بناسم کە ساتەکانی تەمەنم بە فیڕۆ دەدەن؟

پرسیارێکی گرنگە، پێویستە بزانیت چۆن سوود لە کاتەکانت دەبینیت، ئەو هۆکارانە چین، کاتەکانت بە فیڕۆدەدەن؟

باشتر وایە دەفتەرێکی تۆمار پەیدا بکەیتو بۆ ماوەی حەوتوویەك وردو درشتی کارەکانتی تێدا تۆمار بکەیت، گشت ئیشەکانت یاداشت بکە، ئەوانەی تەواوت کردوون، ئەوانی بەجێت نەهێناون، تێفکرە، بزانە هەر ئیشێکان چەندێك کاتی بردوویت، دواتر کاتێك چرکەکان کۆدەکەیتەوە دەبن بە کاژێر.

خشتەیەکی درێژ ڕێك بخە، کاژێرەکانی ڕۆژانەت بۆ شازدە کاژێر دابەشبکە، وەك گریمانەیەك (٨) کاژێرەکەی دابنێ دیکە بۆ خەو.

دواتر هەر کاژێرێك دابەش بکە بۆ چوار بەش، واتە: (١٥) چرکە، دواتر کاتی بەفیڕۆدراو، ئیشی تەواوکراو تۆمار بکە، لە کۆتاییدا پێویستە شیکارێکی خشتەکە بکەیت، هۆکاری بەفیڕۆدانی وەختەکانت دیاری بکەیت، ئنجا لە خۆت بپرسە: ئایا دەتوانم بە باشترین شێوە، کاتەکانم ڕێك بخەم؟ ئەگەر وەڵامەکەت بەڵێ بوو؛ ئەوا پێویستە بە دوای هەلەکاندا بگەڕێیت.

هێندە سەرقاڵم، کاتم نییە بۆ ڕێکخستنی ساتەکانی ژیانم!

دەگێڕنەوە داربڕێك لە دارستانێکدا بۆ بڕینەوەی دارێك کۆششی دەکرد، هاوکات تەورەکەی کول بوو؛ چونکی پێشتر تیژی نەکردبوو، لە کاتێکدا ڕێبوارێك بەو حاڵەوە بینی، گوتی: بۆچی تەورەکەت تیژ نەکردووە؟ لە کاتێکدا ئەو سەرگەرمی کارەکەی بوو گوتی: نابینیت چەند سەرقاڵم؟! ئەو نەیدەزانی تیژکردنی تەورەکە لە هەرچی تەواوکردنی کارەکەیدا یارمەتی دەداو دەتوانێ لە دارێکەوە بۆ دارێکی دیکە بگوێزێتەوە.

کێ دەڵێت ئەوی سەرقاڵە، ناتوانێت کاتەکانی ڕێك بخات! ئەوکەسە بارودۆخی وەك داربڕەکە وایە، چون ئەگەر ئەو تەورەکەی تیژکردبا لە زوتر بڕینەوەی دارەکەدا یارمەتی دەدا، هەروەسا ڕێکخستنی کاتیش وایە، یارمەتی دەدات هەرچی زوتر کارەکانی تەواو بکاتو هەلی زیاتر بۆ تەواوکردنی کارەکانی بدۆزێتەوە.

هاوکێشەیەکی سادەیە، پێویستە بەر لە تۆوکردن زەوییەکە ئامادە بکەین، بەر لە دەستپێکی کارەکان ئامرازەکان ئامادە بکەین، کاتگێڕیش بە هەمان شێوەیە، دەستپێك دەبێت بۆ بەسەربردنی ساتەکانی ڕۆژ، پلانمان هەبێت.

هەموو شتێك پێویستی بە ڕێکخستن نییە، تەنها پرۆژە گەورەکان، پێویستیان بە ڕێکخستنی کاتە!

لە ئامارێکدا ئاشکرا کراوە، کە کارە گچکەکان، ساڵانە کاتێکی زۆر بە فیرۆدەدەن، بە نموونە: ئەگەر ڕۆژانـە لە ماڵەوە، تا شوێنکارەکەت پێویستت بە (١٠) خولەك بێتو لە لە گەڕانەوەشدا هێندە کاتت گەرەك بێت، واتە: لەو پێناوەدا ڕۆژانە بیست خولەك لە ساتەکانی تەمەنت دەگوزەرێنیت، ئەگەر کارەکە، زیاتر ورد بکەینەوە، ئەنجامەکەی بەم شێوەیە دەبێت:

ڕۆژانە بیست خولەك، لە حەوتویەکدا کە (٥) لە ڕۆژەکانی ڕۆژی کارکردنە دەکاتە:

٥ X ٢٠ = ١٠٠ خولەك.

١٠٠ خولەك لە هەفتەیەکدا X ٥٣ حەفتە لە ساڵێکدا = ٥٣٠٠ خولەك =لە ساڵێکدا ٨٨ کاژێر.

ئەگەر ڕۆژانە ئەو ماوەیە لە کاتی بە سوودا تەواو بکەیت، ئەنجامەکەی چی دەبێت، بە نموونە: ئەگەر لە گوێگرتن لە کاسێتی فێربوونی زماندا، یاخود فێربوونی زانستێکدا، یان لە بیرکردنەوە لە کاری داهێنەرانەدا تـەواوی بکەیت، یاخود لە بینینی ئەو شتانەی دەبینیت، پاشان نووسینەوەیان لە شێوەی یاداشتی بەسووددا و... هتد. ئەنجامەکەی چی دەبێت؟

دەمەوێت کاتەکانم ڕێك بخەم، بەڵام کەسانی دی بوارم پێنادەن!

کارێکی ئاسانە سەرکۆنەی کەسانی دی بکەیت، بـەڵام لە گونجاندنی ساتەکانی تەمەنت، تەنها بەرپرس خۆتی، ئەوە تۆیت، بویت بە ئامراز بە دەست کەسانی دیکەوەو کارەکانیان تەواو دەکەیت! دەتوانیت بە ڕێزو بوێرییەوە پۆزش بۆ کەسانی دی بهێنیتەوەو بە گوێرەی گرنگترینیان (لە پێشترینیان) کارەکانت بگونجێنیت، ئەگەر خۆت ڕێك نەخەیتو نەخشە بۆ ئامانجەکانی ژیانت نەکێشیت، بێ شك دەبیت بە ئامراز بە دەست کەسانی دیکەوە کارەکانی خۆیانت پێ تەواو دەکەن.

**ئایا بەهۆی ڕێکخستنی کاتەوە سرووشتی خۆم لە دەست نادەم نابم بە ئامرازێك؟**

نەخێر، نابێت بەم شێوەیە تەواشای ئەم بابەتە بکرێت، ڕێکخستنی کـات ئـەوە نییە، تـۆ ببیت بـە ئـامـرازێكو کـارە نەخشەبۆکێشراوەکان جێبەجێ بکەیت، ڕێکخستنی ساتەکانی ژیـان، پێویستی بە گونجاندنە، بۆ ڕێکخستنی کاتەکانمان، چەندێك کۆشش بکەین، کارگەلێك لە بەردەمماندا قوت دەبنەوە، کە بە بیرماندا نەهاتوون، یاخود بەهەندمان نەگرتوون.

لێرەدا، پێویستە هەڵوەستەیەك بکەینو بیر بکەینەوە، ئایا بیرمان لە کارەکە کردووەتەوە، یاخود لەپڕ سەری هەڵدا، وەڵامەکانی ئەو پرسیارانەش، بەگوێرەی گرنگترینیان دەگۆڕێت، ئەو کات، کارە خۆویستەکان، زیاتر گرنگییان پێ دەدرێتو زیاتر لۆژیکانە دەبن؛ چون کارەکان بەر لە ڕێکخستنیان، هەڕەمەکی بوون.

**ئایا نووسینەوەی ئامانجەکانو پلانەکان، کاتکوژ نین؟!**

گریمان دەخوازیت گەشتێك بکەیت، کە چەند ڕۆژێك دەخایەنێت، چی دەکەیت؟ کارێکی ئاسایی، دەبێت نەخشە بۆ گەشتەکەت بکێشیتو پێداویستییەکانی ئامادە بکەیت، ژیان بەگشتی گەشتە، بەڵام گەشتێکی درێژخایەن، بۆیە پێویستە بەردەوام پلان دابنێینو خۆمان ئامادە بکەین، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئاستەنگەکان.

بزانە هـەر کاژێرێك لە نەخشەکێشان، (٤) کـاژێـرت لە جێبەجێکردنی کارەکانتدا بۆ پاشەکەوت دەکـات، باشە چی ڕوو دەدات ئەگەر ڕۆژانـە کاژێرێك نەخشە بکێشیتو (٢) کاژێر پاشەکەوت بکەیت؛ ئـەوا لە ساڵێکدا حـەوسـەدو سی کاژێرت بۆ دەمێنێتەوەو دەکرێت لە گرنگیدان بە خێزانو خۆ پەروەردەکردنندا تەواوی بکەیت.

**بەهۆی ئەو باردۆخانەی پێیاندا تێ دەپەڕم، ناتوانم کاتەکانم ڕێك بخەم، چی بکەم؟**

هیچکات نـیـگـەران مـەبـە، ئـەو بـیـرکـردنـەوەیـە کارێکی سرووشتییە، ئەو ژنەی منداڵی دەبێت، پێویستە زیاد لە دووساڵ، بەردەوام گرنگی بە منداڵەکەی بدات، باشە ئەو چۆن دەتوانێت ساتەکانی بەردەستی ڕێك بخات؟ پێویستە چی خشتەو تێنووس هەیە بیخاتە لاوەو گرنگی بە منداڵەکەی بدات. ئەوە نموونەیەکی گچکەیە، دەتوانرێت کارە گرنگەکانی پێ پێوانە بکرێت.

**پێویست ناکات ئامانجەکانم لە پەڕەیەکدا بنووسمەوە، یان نەخشەیان بۆ بکێشم، دەزانم پێویستە چی بکەم؟**

هیچکات یادگەیەکی تەواو نەبووە! بێگومان کۆمەڵێك کارگەلی گرنگ هەیە، دەبێت نەخشەیان بۆ بکێشرێتو یاداشت بکرێن؛ چونکە بەم هەنگاوە، کۆمەڵێك دەستکەوتی گرنگ بەدەست دەهێنین، لەوانە پاساوێك نابێت بۆ بیرچوونەوە؛ چونکە کارەکان یاداشت کراون، ئەو هەنگاوەش، یارمەتیت دەدات لە کارە گرنگەکانو لە پێشترینیانەوە، دەست پێ بکەیت.

**ژیانم زنجیرەیەك قەیرانی یەك‌لەدوایەکە، چۆن ساتەکانی ژیانم ڕێك بخەم؟!**

کاتگێری یارمەتیی کەمکردنەوەی قەیرانەکان دەدات، زیاد لەوکارەش، هاوکارت دەبێت کە قەیران لە گۆشەیەکدا بپەستێت، بزانە ڕێکخستنی کات، گشت قەیرانەکان کۆتایی پێ ناهێنێت، بەڵام تا ڕادەیەکی زۆر، یارمەتیی کەمکردنەوەیان دەدات.

**ئایا کۆمپیوتەر، یارمەتیی ڕێکخستنی کاتەکانم دەدات؟**

بێگومان؛ چونکە کۆمپیوتەر بۆ کاتگێری، ئامرازێکی گونجاوە، ئەوەی لە سەرت پێویستە، هەڵبژاردنی بەرنامەیەکی گونجاوو بەکارهێنانێتی بەبەردەوامی.

**ئایا شێوازێك هەیە بۆ کاتگێری؛ تا هەموو کەس کاری پێ بکات؟**

نەخێر، هـەر کـەسێك شێوازێکی بـۆ گـونـجـاوە؛ چونکە هەر کەسێك خـاوەن تایبەتمەندیو بارودۆخی تایبەتە، بۆیە هـەر یەکێکمان بەرپرسین لە خـۆمـان، پێویستە بەگوێرەی پێداویستییەکانمان کاتەکانمان ڕێك بخەین.

ئەوانەی باسکران، کۆمەڵێك پرسیارن زۆرجار لە خۆمانی دەکەین، یاخود بە بیرو ئاوەزماندا گوزەر دەکەن، هۆشو هزرمان بۆ ماوەیەك داگیر دەکەن، ئەوانەی ڕاڤەکران، وەڵامی درووستی ئەو خاتیرەو پرسیارانەن.

# Incoterms® 2010

by the International Chamber of Commerce (ICC)

# زاراوەکانی بازرگانیی نێودەوڵەتی

بەشی پێنجەم

محمد هاشم محمد



باسی ئەوەمانکرد، کە زاراوەکانی بازرگانیی نێودەوڵەتی (شـروط التسـليم) لە (INCOTERMS2010) دابەش و پۆلێنکـراوە بـۆ ئـەم (١١) زاراوەیە، ئەویـش دەکرێتە (٤) گرووپ:

١- گرووپـی یەکـەم: کۆمەڵـەی (E) دەرچـوون، وەکو (EXW).

٢- گرووپـی دووەم: کۆمەڵەی (F) پارەی گواسـتنەوەی سـەرەکی (Main Carriage) نـەدراوە، وەکـو (FAS, FCA, FOB).

٣- گرووپی سـێیەم: کۆمەڵەی (C) پارەی گواستنەوەی سـەرەکی (Main Carriage) دراوە، وەکو (CFR, CIF, CPT, CIP).

٤- گرووپـی چوارەم:کۆمەڵـەی (D) گەیشـتنن، وەکـو (DAT,DAP,DDP).

لـە بەشـی چـوارەم باسـی گرووپـی دووەممانکرد کە کۆمەڵەی (F) بوو، ئەویش (٣) سـێ زاراوە لە خۆ دەگرێت، ئەویـش زاراوەکانـی (FAS, FCA, FOB). لـە بەشـی ڕابوردوو، باسـی زاراوەی (FCA)شـمانکرد، بەرپرسیارێتی کڕیـارو فرۆشـیارمان خسـتە ڕوو لـە کاتی کڕینـی کاڵاو کەرەسـتەکان، لە وڵاتی فرۆشیار، تا دەگاتە کۆگاکانی کڕیار لە وڵاتی کڕیار.

لە بەشـی پێنجەمدا لە باسی گرووپی دووەم: کۆمەڵەی (F)کە پارەی گواسـتنەوەی سەرەکی نەدراوە، باسی زاراوەی (FAS) دەکەین، با پێکەوە بزانین ئەم زاراوەیە لە بازرگانیی نێودەوڵەتی چی دەگەیەنێت.

**(تسليم البضائع بجانب السفينة - رصيف الميناء المتفق عليه للتصدير - ميناء الشحن معين) FSA - FREE ALONGESIDE SHIP**

**گەیاندنو تەسلیمکردنی کەرەستەکان لەتەنیشت کەشتییەکەوە - ساحەی ئەو بەندەرەی کە ڕێککەوتوون لەسەری بۆ هەناردەکردن، شوێنی بارکردنی مەوادەکان دیاریکراوە لە چ بەندەرێک دەبێت**

| بەرپرسیارێتیی کڕیار (Bayer) | بەرپرسیارێتیی فرۆشیار (Seller) |
|---|---|
| * وەرگرتنــی مەوادەکان لە فرۆشــیار، لە شــوێنی دیاریکراو لەسەر شۆستەی تەنیشت کەشتییە بارهەڵگرەکەوە.<br>* تەواوکردنی ڕێوشــوێنی هێنانــە ژوورەوەی مەوادەکان بۆ ناو وڵاتی خۆی.<br>* پێویســتە پــارەی گواســتنەوەی ســەرەکی (Main Carriage)و گرێبەستکردن بگاتو پارەکەشی بدات.<br>* دیاریکردنی ناوو شــوێنی ئەو کۆمپانیایەی کە مەوادەکان دەگوازێتــەوەو گرێبەســتکردن لەگەڵــیو بەرپرســیار دەبێت لە بارکردنو هێنانەوەی مەوادەکان، تا وڵاتی خۆی هێنانە خوارەوەی بۆ ناوکۆگاکانی.<br>* بەرپرســیار دەبێت لە دانی پارەی بارکردنو گواســتنەوە، پاش دیاریکردنی شوێنی تەسلیمکردن کە تەنیشت کەشتییەکەیە.<br>* بەرپرسیار دەبێت لە ئامادەکردنی دۆکیومێنتەکانی هێنانە ژوورەوەی ناو وڵاتی خۆی.<br>* وەرگرتنــی مــەوادەکان لــە شــوێنی دیاریکراو شۆســتەی تەنیشت کەشــتییە بارهەڵگرەکەوە، ڕادەستکردنی بۆ گواستنەوە، دڵنیاییکردنــی مــەوادەکان، ڕادەســتکردنی مــەوادەکان لەکاتــی گەیشــتنی وڵاتی خۆی، دانی گشــت پارەی گومرکو باجو حازری دەکات بۆ وەرگرتنی مەوادەکان، بارکردنو گواســتنەوەیو هێنانە خوارەوەی لەناو کۆگاکانی خۆی لە وڵاتی خۆی (کڕیار). | * ئامادەکردنی کەرەستەو کاڵاکان بۆ بارکردنی.<br>* بەرپــرس دەبێت لە گواســتنەوەی (Pre-carriage) کە لەناو وڵاتی خۆی دەکرێت.<br>* تەواوکردنی گشت مامەڵەکانی ناو وڵاتی خۆیو ئامادەکردنی دۆکیومێنتی پێویست، بۆ هەناردنی مەوادەکان.<br>* تەســلیمکردنی مــەوادەکان بــە کۆمپانیای گواســتنەوەی دیاریکراو لەلایەن کڕیارو لە شــوێنی دیاریکراو لە سەر شۆستەی تەنیشت کەشتیی بارهەڵگری دیاریکراوەوە.<br>* بەرگتێگرتن، بارکردن لەناو کۆگاکانی خۆی، گشت کارەکانی پێش تەســلیمکردن، دانی گشت پارەی گومرکو باجو تەواوکردنو تەسلیمکردنی گشت دۆکیومێنتی پێویست بە هەناردن (التصدير) بەکڕیــار، بۆ تەواوکردنی ڕێوشــوێنی هێنانــە ژوورەوەی بۆ ناو وڵاتی خۆی. |






بڕیاری منداڵان

# شانشینی کەڵەشێر

و: محەمەد مێرگەیی

کەڵەشێرێکی پەڕوباڵ شین، چووە سەر گردۆڵکەیەکی بڵندو بە هەموو دەنگی، هاواری کرد:

ئەمە شانشینی منە.. من پادشای ئێرەم.

مریشکەکان هاتنو لە چواردەوری گردۆڵکەکە کۆبوونەوە، ئینجا دەستیان کردە چەپڵەلێدانو بە دەنگی بەرز هاواریان کرد:

- هەربژی، هەمیشە.. پادشای شینمان!

- شانشینی من ئێرەیە، شانشینی من.

چەپڵەی مریشکەکان توندتربوو، کەڵەبابیش تەماشایەکی کردنو گوتی:

ئێوە هەمووتان خزمەتکارن لای من، ئەمن پادشاهی شینم.

چەپڵەی مریشکەکان پتر دەبێتو هاتو هاوارەکانیش بەرزتر دەبن:

ئەی پادشای مەزنمان.. ئەمڕۆ ڕۆژی جەژنی تۆیە.

تۆ سەرۆکمانی.. ئێمەش سەربازی تۆین.

ڕۆژی دواتر، بەر لە هەڵهاتنی گزنگی خۆر، کەڵەشێرەکە سەیری ئاسمانی دەکردو دەیگوت:

- من پادشاو خۆریش کاتێك هەڵدێت، کەوا من دەخوێنم: کوکو... کوکو...

ئەی خۆر ئێستا دەرکەوەو ڕۆشناییت پەخش بکە.

مریشکەکان تەماشای ئاسمانیان کرد، چاوەڕێی هەڵهاتنی خۆر بوون، بەڵام خۆر هەڵنەهاتو هەر دەرنەکەوت، لەبەرئەوەی هەورێکی چڕ، خۆری داپۆشی بوو، دای بڕی بوو لە زەوی.

دواتر هەورە چڕەکە، دای کردە ڕێژنەباران، ئینجا بوو بە جۆگەیەکی بەخوڕو گردۆڵکەکەی لەگەڵ خۆیدا ڕامالی، ئەو گردۆڵکەیەی شانشینی کەڵەبابی شین بوو؛ چونکە گردۆڵکەکە لە لمو خۆڵ بوو، شانشینی کەڵەشێری شین، پتەوو قایم نەبوو، بۆیە بە چاوترووکانێك داڕما، هەرەسی هێناو لەناوچوو.

ئیدی کەڵەشێری شین، لە شەرمەزاریداو لەترسی دەنووکی مریشکەکان، ڕای کردو بەدوای کونو قوژبنێك دەگەڕا، بەڵکو خۆی تێدا حەشار بدات.

مریشکەکانیش بەدوای کەوتبوونو هەر هاواریان دەکرد:

ئەی درۆزن.. ئەی فریودەر.. ئێمەت چەواشە کردو وات لێکردین چەپڵە بۆ گردۆڵکەی خۆڵ لێ بدەین!!



سەرچاوە: گۆڤاری (العربي الصغير)، ژمارە ٣٧١، ٢٠١٥

ڕۆشنبیری تەندروستی!

# جگەرەو نێرگەلە کێشان ٢\١

### ١- مەترسییەکانی جگەرەو نێرگەلەکێشان:

گەر یەکێکمان بەتاموچێژترین خواردنی لە بەردەستدا دابنرێت، پاشان هەواڵی پێ بدرێت، ئەم خۆراکە ژەهری تێدایە، ئایا دەیخوات؟ دەستی لێدەدات؟ نەخێر هەرگیز..! کەواتە: چۆن کەسانێك جگەرە دەکێشن، لە کاتێکدا دەزانن لە ژەهر خراپتر لە جگەرەدا هەیە؟!

گەر جگەرەکێشەکان بیانزانییایە، چەندە ترسناکو بەزیانە، هەرگیز جگەرەیەکیان نەدەکێشا!.

* ئایا دەزانیت زیاد لە (٤٠٠٠) ماددەی کیمیایی لە پێکهاتەی جگەرەدا هەیە؟ (٥٠) ماددەیان دەبن بەهۆی شێرپەنجە؟

* ئایا دەزانیت ئەو ماددە کیمیاییانەی بەکار دێت لە سووتەمەنیی موشەکەکان وەك(میثانوڵ)و درووستکردنی بۆیاخو پاککەرەوەکاندا، لە جگەرەشدا هەیە؟

* ئایا دەزانیت هەر جگەرەیەك، (٨) خولەك لە تەمەنی جگەرەکێش کەم دەکاتەوە؟ هەموو (٨) چرکەیەك، کەسێك بەهۆی جگەرەکێشانەوە دەمرێت لە جیهاندا؟!

* لە دە جگەرەکێش، سیانیان لە داهاتوودا هۆی مردنەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ نەخۆشییەك، کە جگەرە درووستی کردووە!

* ساڵانە زیاد لە (٤ملیۆن)خەڵك بەهۆی جگەرەکێشانەوە دەمرن، ڕێکخراوی تەندرووستیی جیهانی (WHO) دەڵێت: ئەم ڕێژەیە ساڵانە دەگاتە (١٠ ملیۆن)!

* کۆی ئەو مردنانەی ساڵانە لە ئەنجامی جگەرەکێشانەوە ڕوو دەدات، زیاترە لەو مردنانەی بەهۆی هەموو ئەمانەوە ڕوو دەدات: (ڕوداوەکانی هاتوچۆ، خواردنەوەی کهولی، ماددە بێهۆشکەرەکانو نەخۆشیی ئایدز) ئەمەش دەری دەخات، چەندە مەترسیدارە!

ڕێکخراوە تەندرووستییە جیهانییەکان، بەردەوام ئەم زانیارییانە بڵاو دەکەنەوە لەسەر زیانەکانی جگەرەکێشان، سا بەڵکوو خەڵکی بەهۆی ئەم مەترسییانەوە، لێی دوور بکەونەوە.

هەروەها زۆر لە کۆمپانیا بەرهەمهێنەکانی جگەرە دەکەن؛ تاکو لەسەر پاکەتەکە پێکهاتەکانی جگەرەکە بنووسن، ئەوانیش هەندێکی باس دەکەنو زیانیاریی وردی لەسەر نادەن، تاکو زیان بە بازرگانییەکەیان نەگات!

کۆمپانیاکان هەندێك تامی دیکەی وەك میوەی تێدەکەن؛ تا تامی خۆشتربێت، هاوڕێ لەگەڵ هەندێ ماددەی دیکە؛ تاکو کاریگەریی نیکۆتینەکە بەهێزتربێت!

### ٢- جۆرەکانی جگەرەو نێرگەلەکێشان:

أ- جگەرەکێشی ڕاستەوخۆ (active smoker): ئەو کەسەی ڕاستەوخۆ دەیکێشێتو نەفەسی لێدەدات.

ب- جگەرەکێشی ناڕاستەوخۆ (passive smoker): ئەو کەسە دەگرێتەوە خۆی جگەرەکێش نییە، بەڵکو لە شوێنێکدایە، کەسی جگەرە، یان نێرگەلەکێشی تێدایەو دوکەڵەکەی بەسەردا دێت. گەر جگەرە، یان نێرگەلەکێشێکی ڕاستەوخۆ پێنج جگەرە بکێشێتو خەڵکی دیکەی تێدابێت، بەتایبەت گەر شوێنەکە داخراوبێت، ئەو کەسانەی لەوێن، هەریەکەیان وەك ئەوەیە جگەرەیەکی کێشابێت!

### ٣- لە چی ڕێگایەکەوە جگەرە زیانی خۆی دەگەیەنێت؟

سێ پێکهاتەی سەرەکیی هەیە لە جگەرەدا، دەبێت بەهۆی زۆرێك لەو مردنانەی بەهۆی جگەرەوە ڕوودەدەن:

أ- گازی یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن(CO): ئەم گازە کە گەشتە سییەکان، دەکەوێتە پێشبڕکێ لەگەڵ ئۆکسجین لە هەوڵ دایە بۆ گەیشتن بە خڕۆکە سوورەکانی خوێن، کە لەڕێیانەوە ئۆکسجین دەگاتە شانە جیاوازەکانی لەش.. ئەمەیە هۆکاری تەنگە نەفەسی لە جگەرەکێشەکاندا، هەروەها کاریگەریش درووست دەکات لەسەر چاوو گوێو توانای بڕیاردانی مێشك.

ب- ماددەی قەتران(tar): وەك لەزگە بە سییەکانەوە دەنووسێت، چەند ماددەیەکی تێدایە، دەبێت بەهۆی شێرپەنجە.

ج- نیکۆتین (nicotine): لە هەموو ماددەکانی دی ترسناکترە، یەکێکە لە وریاکەرەوەکانی کۆئەندامی دەمار، بەڵام دەبێت بەهۆی ئالوودەبوون، یەکێکە لە هۆکارە سەرەکییەکانی وا لە کەسەکە دەکات، زەحمەت بێت وازلێهێنانی.

نیکۆتیین گوشاری خوێن بەرز دەکاتەوە، لێدانی دڵ خێرا دەکات، لەڕێی هاندانی ئەدرینالەڕژێن لەسەر گورچیلەکان، بۆ دەردانی هۆرمۆنی ئەدرینالین.

### ٤- کاریگەریی جگەرە لەسەر تەندرووستی:

أ.جگەرەو دڵ: یەکێکە لە سێ هۆکارە بنچینەییەکانی سنگەکوژێ، جەڵدەی دڵو نەخۆشییەکانی خوێنبەری تاجیی دڵ، لە (٣٠٪)ی ئەوانەی بەهۆی نەخۆشییەکانی خوێنبەری دڵەوە دەمرن، بەهۆی جگەرەوەیە.



ب- جگەرەو شێرپەنجە: لە (٨٠٪)ی شێرپەنجەی سییەکان، بەهۆی جگەرەکێشانەوەیە، لە (٩٠٪)ی تووشبووان لە ماوەی پێنج ساڵدا دەمرن.

هەروەها جگەرە، ڕێژەی شێرپەنجەکانی میزەڵدان، گورچیلە، دەم، سوورێنچك، گەدەو پەنکریاس زیاد دەکات. لە (٣٠٪)ی هەموو جۆرەکانی شێرپەنجە پەیوەندیی بە جگەرەوە هەیە!

ج- جگەرەو کۆئەندامی هەناسە: سەرەڕای شێرپەنجەی سییەکان، دەشبێت بەهۆی هەوکردنی بۆری هەوا، تەسکبوونەوەی ڕێڕەوی هەناسەدان، هەناسەتەنگبوون بە کەمترین بڕی چالاکیو خۆماندووکردنو کۆکەو بەڵغەمی بەردەوام.

د- جگەرەو کۆئەندامی هەرس: دەبێت بەهۆی زیادبوونی زامی گەدە، شێرپەنجەی کۆڵۆنو کێشەی دیکەی هەرسکردن.

هـ- جگەرەو پێست: دەبێت بەهۆی زوو چرچولۆچبوونی پێست، هەروەها دواکەوتنی سارێژبوونەوەی برین.

ن: د. حسان شمسی پاشا

و: یەحیا محەممەد عەلی



# سوودەکانی هەنجیر

هەنجیر یەکێکە لە میوە بەتامو خۆشەکان، یەکێکە لەو میوانەی زۆربەی کەس ئارەزووی دەکەنو بە میوەیەکی تایبەتی دادەنێن، بێجگە لە بەتامییەکەی، لە هەمان کاتیشدا زۆر بەسوودە، زۆربەی توخمە خۆراکییەکانی تێدایە، بەتایبەتی کالیسیۆمو فسفۆرو ڤیتامین C. سەرەڕای بوونی بڕێکی زۆری شەکر.

**سوودەکانی هەنجیر:**

**یەکەم: پاراستن لە شێرپەنجە:-**

هەنجیر ئاوێتەی (کومارین)ی تێدایە، دەتوانێت مەترسی تووشبوون بە نەخۆشیی شێرپەنجەی پرۆستات کەم بکاتەوە، هەروەها خواردنی هەنجیر، بەشێوەیەکی ڕێکوپێك، یارمەتیی کەمکردنەوەی تووشبوون بە شێرپەنجەی کۆڵۆنو مەمك دەدات.

**دووەم: کۆلیسترۆڵی خوێن دادەبەزێنێت:-**

بوونی کۆمەڵێك ڕیشاڵ کە توانای توانەوەیان هەیە لە هەنجیرداو بە (پەکتین) ناودەبرێت، یارمەتیی نزمکردنەوەی ڕێژەی کۆلیسترۆڵی خوێن دەدات.

**سێیەم: ڕێگری لە بەرزیی گوشاری خوێنو نۆرەدڵێ دەکات..**

بوونی پۆتاسیۆمو ئۆمیگا سێو ئۆمیگا شەش لە هەنجیردا، یارمەتیی پاراستنی ئاستی گوشاری خوێن دەداتو ئەوەش ڕێگری لە تووشبوون بە نۆرەدڵێ دەکات.

**چوارەم: گەڵای درەختی هەنجیر، چەندین تایبەتمەندیی تێدایە؛** چونکە ئاوێتەی (دیکۆتیۆن)ی تێدایە، یارمەتیی ئەو نەخۆشانە دەدات، کە نەخۆشیی شەکرەیان هەیە، دەتوانێت تەنها سێ گەڵا هەنجیر بکوڵێنیت لە کووپێك ئاودا، ڕۆژانە دووجار لێی بخۆیتەوە.

**پێنجەم: چارەسەری کەمخوێنیو ماندووبوون دەکات:-**

خواردنی تەنها سێ هەنجیر، ڕۆژانە هەست بە ماندووبوون کەم دەکاتەوە، یادەوەری باش دەکاتو ڕێگری لە کەمخوێنی دەکات.

**شەشەم. چارەسەری قەبزیێ درێژخایەنو مایەسیری دەکات:**

خواردنی دوو هەنجیر ڕۆژانە، بەیانیو ئێوارە، گەدەو ڕیخۆڵەکان نەرم دەکاتەوەو دەبێت بەهۆی ئەوەی لە قەبزی ڕزگار ببیت.

هەروەها خواردنی ٣ هەنجیر، ڕۆژانە بۆ ماوەی مانگێک، چارەسەری مایەسیری دەکات بەتایبەتی ئەگەر سەرەتاکان بێت، یان ئەگەر لەو جۆرە بێت، کە پێویست بە نەشتەرگەری ناکات.

**حەوتەم: چارەسەری دومەڵو برین دەکات:**

کاتێك هەنجیر لەسەر پێستێك کە دومەڵ، یان برین کە هەویان کردبێت، چارەسەری هەوکردنەکە دەکات، دەتوانیت هەنجیرێك بکوڵێنیت (باشترە بە مایکرۆوەیڤ بێت) پاشان هەنجیرەکە بکرێت بە دوو بەشەوەو لەسەر برینەکە، یان دومەڵەکە بۆ ماوەی دوو تا سێ کاتژمێر دابنرێت.

**هەشتەم: پێست پاك دەکاتەوەو چارەسەری زیپکەی هەرزەکار دەکات.**

بە پێی ئەو بڕە ئاوەی لە هەنجیردا هەیە، وەك پاککەرەوەیەك بۆ پێست بەسوودە، ئەگەر وەك هەویری لێبکرێتو بخرێتە سەر پێست، هەروەها یارمەتیی پاراستنی پێست دەدات، لە دروست بوونی زیپکە.

**نۆیەم: هەنجیر جێگرەوەی بەرهەمەکانی شیرە:**

هەنجیر دەوڵەمەندە بە کالیسیۆم، کالیسیۆمیش جێگرەوەیەکی نایابە بۆ ئەو کەسانەی کە بەرامبەر شیرەمەنییەکان هەستیارییان هەیە، بەتایبەتی منداڵان، ئەگەر منداڵەکەت ماست، یان بەرهەمەکانی دیکەی شیر ناخوات، دەتوانیت قەرەبووی ئەوەی بۆ بکەیتەوە، بە پێدانی ٣ هەنجیر ڕۆژانە.

**دەیەم: پاراستن لە بەکتریاو ڤایرۆس:-**

هەنجیر دەوڵەمەندە بە ئاوێتەکانی (بینزلدهاید)ی سرووشتی وەك فینۆڵ، دژی درووستبوونی گرێیە، هەروەها لە توانایدا هەیە، ڤایرۆسو بەکتریاو کەڕووەکان لەناو ببات، کە دەبن بەهۆی نەخۆشی لە مرۆڤدا.

**یانزەیەم: چارەسەری قەڵەوی دەکات:-**

سەرەڕای ئەوەی هەنجیر، میوەیەکە یەکەی گەرمیی بەرزە (بەتایبەتی هەنجیری وشك)، بەڵام زۆر دەوڵەمەندە بە ڕیشاڵ یارمەتیدەرێکی باشە بۆ پرۆگرامی دابەزاندنی کێش.

**دوانزەیەم: زۆر چالاکە لە بەهێزبوونی ئێسکدا:-**

لەبەرئەوەی بڕێکی زۆر بەرز کالیسیۆمو پۆتاسیۆمی تێدایە، توانای ڕێگەگرتنیان هەیە لە لاوازبوونی ئێسکو یارمەتیی زیادبوونی چڕی ئێسکەکە دەدات.

**سیانزەیەم: چارەسەری کەمخەوی دەکات:**

لە هەنجیردا ئاوێتەکانی (تریبتوفان) هەیە، بوونی ئەم ئاوێتەیە، هۆکارێکی باشە بۆ خەوێکی باشو یارمەتیی نەهێشتنی کەمخەوی دەدات.

# ڕێزگرتن لە ڕاستی

و: ئاسیا صەلاح

ئازیزانم، مەزنیی مرۆڤ، واتە: مەزنیی ئەو شتانەی کە باوەڕی پێیەتی، قوربانی بۆ دەداتو پارێزگاری لێ دەکات، ئایینە پاکەکەمان، کە شانازی پێوە دەکەین، ئاڕاستەمان دەکات بەرەو خۆشویستنو ڕێزگرتنی ڕاستی؛ تا وەك خۆی مامەڵەی لەگەڵدا بکەین، بێ ڕازاندنەوەو هیچ زڕاندنێك. ڕاستی لەلایەن خوداو پێشەوامانەوەیە، کە بە هەق نێردراوە، ئاسمانو زەویش هەر بە ڕاستەقینەیی دروستکراون. هەر بۆیەش دڵنیابوونەوە لەوەی گوێمان لێی دەبێتو دەیخوێنینەوە سەرەتایەکمان بۆ دەسازێنێت لە لایەنگریو سەرخستنی هەق.

ڕۆژانە چەندەها هەواڵی گوێزراوە دەبیستین، شتانێکی زۆر دەخوێنینەوە، کە لەسەر هێڵی ئینتەرنێت دەنووسرێت، کە زۆرینەی سەرچاوەکانیان نەزانراوە، بگرە زۆربەی ناوی کتێبەکان وەرگیراوە، سەرچاوەی زۆربەی گەیەندراوەکان نەزانراوە... ئەمەش واتە: با پەلە نەکەین لە بڕواکردن بە هەرچی کە دەیبیستینو یەکسەر بڵاوی نەکەینەوەو بیگەیەنین؛ تا نەبینە هاوکارێك بۆ بڵاوکردنەوەی هەواڵی بێبنەماو دوور لە ڕاستی، ئێوەش دەزانن خودای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَن تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ ﴾ الحجرات: ٦

(واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە! ئەگەر فاسقێك هەواڵێکی بۆ هێنان، دەستبەجێ بە ڕاستی مەزانن و بکەونە پەیجۆر؛ تا بۆتان دەردەکەوێت ڕاستیو درۆیی هەواڵەکە چۆنە، نەوەك بێئاگاو بە نەزانیی خۆتان کۆمەڵە خەڵکێ گرفتارو تووش بکەن، پاشان لەو کارەی کردووتانە پەشیمان ببنەوە). هەروەها دەفەرموێت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَتَبَيَّنُوا وَلَا تَقُولُوا لِمَنْ أَلْقَىٰ إِلَيْكُمُ السَّلَامَ لَسْتَ مُؤْمِنًا تَبْتَغُونَ عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ﴾ النساء: ٩٤ (واتە: ئەی خاوەن ئیمانەکان! کاتێك چوون بۆ تێکۆشان لە ڕێگەی خودادا، زۆر چاك ورد ببنەوە لە ئەحواڵی خەڵك؛ تا بێباوەڕو موسوڵمان، لەیەك جیا بکەنەوە. پەلە مەکەنو مەڵێن بەو کەسەی سەلامتان لێ دەکات: تۆ موسوڵمان نیت، لەبەر پاراستنی گیانی خۆت سەلام دەکەیت، پەلە مەکەن لە کوشتنیدا بۆ تاڵانو سامانی دونیا). ئەمە ئاڕاستەکردنێکی بەخشندانەیە بۆ ئیمانداران، کە لە جەنگدا پەلە نەکەن لە کوشتنی هیچ کەس، هەتا دڵنیا نەبن لە موسوڵمانیو بێباوەڕی.

### ئەمە چی دەگەیەنێت لای کچو کوڕانم؟

خۆتان ڕابهێنن، کە هەرچی دەیبیستن بڕوای پێ نەکەن لەڕێگەی پرسکردنو بەکارهێنانی ئەقڵتان، ڕای بهێنن کە ئیدی گەیاندنو بڵاوکردنەوەی لە نێوان خەڵکیدا کەم بکاتەوە، پێشەوامان ﷺ دەفەرموێت: بەسە بۆ کەسێك بکەوێتە ناو درۆوە، چی بیست بیگێڕێتەوە.

هەمیشە هەوڵی گەڕان بدەن بە دوای سەرچاوەی ئەو شتانەی دەیبیستن، هەروەها گەیەنەرەکەشی بزانن، ئایا جێگەی متمانەیە، یاخود نا؟

زۆربەی کات سەلماندنی ئەوەی دەیبینین، زۆر زیاترو قورسترە لە سەلماندنی ئەوەی دەیبیستن، تا زنجیرەی گێڕەرەوەکانو گەیەنەرەکانی هەواڵەکە زیاتر بێت، ئەگەری ڕوودانی هەڵەو نادرووستی زیاد دەکات.

ئەزموونو ڕاستییەکان دەری دەخەن، کە گەیاندنی زارەکی، زۆر ورد نییە، خەڵکیش هەر لە زۆرکردنی هەواڵە زارییەکاندان، بەپێی هەواو ئارەزووی خۆیان، بە وشەکان مامەڵە لەگەڵ ئەوەدا دەکەن کە دەیبیستن، متمانەش بە هەموو وردەکارییەکانی مەکەن.

هەر کاتێك هەواڵەکە سەیرو سەبارەت بە شتانێك بوو، کە پێی ئاشنا نین، پێویست دەکات بوەستینو لێی دڵنیا ببینەوە؛ چونکە زۆربەی ئەوانە ناڕاست دەردەچن، یاخود زیادەڕۆییان تێدا کراوە.

هەرگیز بارستایی شتەکە، ئاستو ڕاستو هەڵەی نازانی، هەتا تەواو دەبێت، بۆیە ئەوەی لە ئێوە داوا کراوە پشوو درێژ بن، لە بڕیارداندا، هەتا قسەکەر لە گوتەکانی تەواو دەبێت، نووسەریش لە نووسینەکەی تەواو دەبێتو ئەوەشی بە چەند بەشێك تەواوی دەکات.



و: چیمەن لەتیف



# لە نێوان
# هوتافی نەمریو پرشنگی ناوبانگدا

خراپترین شت، کەسێکی دیاریکراو بیکات لە ڕووبەڕووبوونەوەی جەماوەردا، ئەوەیە چاوی لەسەر بریقو باقی ناوبانگ بێت. داوای ناوبانگ بکات، کۆششی بۆ بکاو بەشوێنیدا هەڵێت.

کتێبێك لە پێناو ناوو دەنگدا دەنووسێت.. لە بەردەم کۆمەڵانی خەڵکدا، بەمەبەستی دەرکەوتن، گوتەیەك پێشکەش دەکات، لە پێشەوەی کۆڕو کۆمەڵەکاندا دەردەکەوێت؛ تا لە چاوی کامێراکانەوە دیاربێت.

بەمشێوە وەفاتنامەکەی دەنووسێتەوەو بە خوێنساردییەوە واژۆی دەکات، بەڵام کەڵەپیاوان، بە هیچ شێوەیەك وا بیر ناکەنەوە، ئەوە ڕێگای ژیانیان نییە، گەورە پیاوان، کاتێك لە پێشەوەی ئەنجوومەنێکدا دەردەکەون، لەوجێگایەدا دانیشتوون؛ بۆئەوەی لە دەرگای هزرەکان بدەن. بە ڕاستی، بە جوانیو چاکە، مێشکی خەڵك داگیر دەکەن. کاتێك پشتیان وەسەر کاغەزدا دەچەمێنەوە، ئامانجیان ڕوونکردنەوەی ئەو نادیارانەیە، کە مێشکیان ماندوو کردووەو تێیان ناگات، دەرخستنو پیشاندانی ئەو شتانەیە، کە تێگەیشتنیان ئاڵۆزە.

بەدوای ناووناوبانگدا ناگەڕێن، ئەوە ناوبانگە بە شوێن ئەواندا ڕادەکات.

ئایا بڕوا دەکەیت، کاتێك ئەدیبی ناسراو (مستەفا صادق الرافعي) کتێبی (سرووشی قەڵەم)ی نووسی، ئەوەی لە بەرچاوگرتبێت کە وێنەی ئەو لە هزری خەڵکیدا دەرکەوێت، یان بیرمەندێکی وەك (سەید قوتب) کاتێك تەفسیری لە (سێبەری قورئاندا) نووسی، گرنگی بە گوتەی ئەو کەسانە دابێت، کە بە خوێندنەوەی تەفسیرەکە موعجەب دەبن، یاخود (عبدالوهاب المسيري) کاتێك ئینسۆکلۆپیدیای (الصهيونية)ی نووسی، هەڵوەستەیەکی کردبێتو لەبارەی پەرچەکرداری خەڵك، پرسیاری لە خۆی کردبێت؟

بڕواناکەم «وا گومان نابەم»، ئەو گەورەپیاوانە، بەپێی پەیامەکەیان هەڵسوکەوتیان کردووە، بەگوێرەی ویژدان، غەمی گشتیو ئاراستەی پەیامەکەیان هەڵسوکەوت دەکەن.

یەکێکیان گوتەیەك پێشکەش دەکات، لەم پەڕی زەوی، بۆ ئەوپەڕی دنیا دادەنیشنو بۆ ڕاڤەکردنی ئەو قسانە گرد دەبنەوە، بۆچی وای گوت، چۆن وا دەڵێت؟ ناوەڕۆکی ئەم قسانە چینو چیان لە پشتەوەیە..!

ئەوان لە مێشکی ئێمەدا نەمرن، تەنانەت ئەگەر لەگەڵیشاندا جیاواز بین، یان لەگەڵ هەندێك بیروڕاکانیان ناکۆك بین «پێمان خۆش بێت، یان نا» گەرچی فەوتیان کردووە، بەڵام هەمیشە لە ژیانی ئێمەدا، ئامادەییان هەیە.

جیاوازی لە نێوان ئەوەی بەدوای نەمریدا دەگەڕێت، ئەوەی بەدوای ناوبانگدا وێڵە، ئەوەیە؛ ئەو کەسەی شەیدای ناوو دەنگە، تەرمۆمەترێکی پێیە، ستایشو پێداهەڵدانەکانی پێ دەپێوێت. هەرچی ئەو کەسانەیە بە دوای نەمریدا وێڵن، ستایشی خەڵکیان بەلاوە گرنگ نییە؛ چونکە ئەوان خۆیان دەناسن، نەفامیی خەڵك لە خشتەیان نابات.

ئەو گەورەپیاوانە، شەیدای زانستەکەیانن، دڵسۆزن بۆ زانستەکەیان، لەبەرئەوە هەمیشە لە سەرکەوتنو هەڵکشانەوە نزیکن، بەڵام ئەوانەی کار بۆ چەپڵەلێدانو پێداهەڵدان دەکەنو لەسەریان دەوەستن، لە هەڵەو تێکشانەوە نێزیکن.

هەمیشە بەخۆم دەڵێمو دووبارەی دەکەمەوە (نووسەر)، ناوبانگ ئەمانی نییە، فەیلەسوفێك بە مێشەهەنگ ناوی دەبات، کە هەنگوینێکی پاڵفتەی پوختمان دەداتێ، هەمانکاتیش جزووی هەیە، گرنگترین خەسڵەت کە لە مێشەهەنگدا هەیە، ئەوەیە دووباڵی هەیە زۆر بەسانایی دەتوانێت بفڕێتو دوور بکەوێتەوە لێمان، کاتێك ناوت لەگەڵ ئەستێرەکاندا دەهات، وەختایەك دەزانیت لە توێی پەڕەکانی بیرچوونەوەدا خۆت دەبینیەوە!

هەڤاڵان، گشتمان حەزدەکەین چەپڵەمان بۆ لێبدرێت، ئەوە خواستێکی مرۆیانەیە، چەپڵەلێدان بەشێوەیەکی سرووشتی، لە چەسپاندنی خودا تینوێتیمان پاراو دەکات. بەڵام ئەوەی لێرەدا دەمەوێت پێت بڵێمو لە بارەیەوە ئاگادارت بکەمەوە، بەدوای چەپڵەدا مەگەڕێ، زوو، یان درەنگ چەپڵەت بۆ دەکوتن، تەنها گرنگی بە کارەکەت بدە، ئەگەر لە ئێستەدا، کارەکەت دەستکەوتی نەبوو، بەجوانی کارەکەت تەواو بکە، هەستو ڕۆحی تێکەڵ بکە؛ تا کارەکەت نەوەستێتو تووشی وەڕسبوونو بێهیوای نەبێت.

هەمووومان سەرگوزشتەی (شۆبنهاوەر)مان بیستووە، ئەو پیاوەی ژیانی لە نێو بارەها پەرتووکدا، بە نووسین، توێژینەوە، وانەگوتنەوەو فێرکردنی خەڵك تەواو کرد، ئەوەی جێگای سەرسووڕمانە، ئەو بەدرێژایی ژیانی نەناسراوبووە! کەس نەیدەناسی، ناوودەنگ ڕکابەریان دەکرد، تا تەمەنی گەیشت بەحەفتا ساڵ، ئەوکات ناوی لەگشت جێگایەك دەرکەوت، بە شانو باڵیدا هەڵیانداو بە نەمر ناویان دەهێنا، لە گشت شۆێنێك باس باسی شۆبنهاوەر بوو، هەمووان نووسینەکانی شۆبنهاوەریان دەخوێندەوە، ڕۆژنامەکان لە بارەیەوە دەیاننووسیو ڕەخنەگرەکان پەسەندیان دەکرد.

ئەوکات ئەو پیاوە لەوبارەو قسەیەکی کرد، واتایەکی قووڵی هەبوو، گوتی: دوای ئەوەی هەموو تەمەنم بەتەنیایی گوزەراند، ئێستا هاتوون لەسەر گۆڕەکەم دەهۆڵ بکووتن!!

ئەو پیاوە ئەگەر وەدوای ناوبانگ کەوتبا، ئەو ماوە دوورودرێژە دانی بە خۆیدا نەدەگرت، ئەو تەمەنە تووڵانییە خەریکی نووسینو دەرهێنانی تیۆرو لێکۆڵینەوە نەدەبوو، بێئەوەی کەسێك گوێی لێ بگرێت.

هاوڕێ، هیوادارم لە مەبەستم گەیشتبێت، ناوبانگ خراپەیەك نییە پاڵفتە کرابێت، بەڵام ئەگەر بکرێت، بە ئامانج گرفتەکە لێرەدایە؛ چونکە ڕێگرە لەوەی کار بکەیت، بەرهەمو داهێنانت هەبێت، ئەو کات بەخێرایی لە حەوا دەکەوێتە خوارو وەسەر عەردی دەکەوێت، هەست بە تێکشکان دەکەیت، دەست بە سکاڵاو بۆڵەبۆڵ دەکەیت، کاتێك بەشانو باڵتدا هەڵنادەن. چارەسەر: کارەکەت خۆشبوێت، هەستکردنە بە هێزی داهێنانەکانت، هزرت... دڵنیابە پەروەردگار ماندووبوونی کەسێکی لە بەرچاوە، کە کارەکەی بەجوانیو وردەکاری تەواو دەکات.



# لێکدانەوەی کەسایەتیت، بەپێی مانگی لەدایکبوونت..

## مانگی نۆ

لەم ژمارەیەدا باس لە سیفەتە ئەرێنیو نەرێنییەکانی ئەو کەسانە دەکەین، کە لە مانگی نۆدا، چاویان بە ژیان هەڵهێناوە..

بێگومان وەکو هەموو جارێك، جەخت دەکەینەوە، کە ئەم بابەتە توێژینەوەیەکە، مەرج نییە سەد لە سەد وا بێت، بەڵکو زانایانی بواری دەروونناسی، گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی کە مرۆڤەکان بەپێی مانگەکان، سیفەتو هەڵسوکەوتیان جیاوازە. ئەویش دوای تێبینیکردنو بەدواداچوونی ئەو کەسانەی وەکو نموونە وەرگیراونو بەوردی هەڵسوکەوتەکانیان خراوەتە ژێر چاودێرییەوە، بەو هیوایەی ئەم بابەتە، هاوشێوەی ئاوێنەیەك سیفەتی خراپو باشی خۆمان نیشان بدات، دواجار بتوانین سیفاتە خراپەکان، بگۆڕین بە سیفاتی باشو ئەرێنی.

**سیفاتە ئەرێنییەکانی ئەو کەسانەی لە مانگی نۆ دا لەدایك بوون:-**

١- کەسانێکی میهرەبانو بەبەزەیین، هەمیشە حەز دەکەن لە کاروباریاندا خاڵی ناوەڕاست بگرن، واتە: نە زۆر توندو نە زۆریش نەرم.

٢- زۆر حەزمر دەکەنو کەسانێکی هۆشیارو بێدارو بەسەلیقەن.

٣- کەسانێکی نەرمونیانو لەسەرخۆن.

٤- قسەکەرێکی باشن، واتە: ڕەوانبێژو زمانپاراون.

٥- بەخشندەو بەسۆزو خاوەنبەزەیین.

٦- کەسانێکی باوەڕپێکراوو بە خزمەتو لێهاتووو نهێنیپارێزن.

٧- دڵسۆزن لە کارداو حەز دەکەن بەوپەڕی جوانیو دڵسۆزی کارەکانیان ئەنجام بدەن.

٨- بیرمەندو بیرتیژن، لە هەمان کاتدا خاوەنی یادگەیەکی بەهێزن.

٩- کەسانێکی زیرەكو تێگەیشتوون، حەز بە زانستو زانیاری دەکەن.

١٠- حەز بە گەڕان دەکەن بە شوێن زانستو زانیاریدا.

١١- توانای هاندانی خودیان هەیە، بۆ بەرەوپێشچوون.

١٢- حەز بە گەشتکردنو وەرزشکردن دەکەن.

**سیفاتە نەرێنییەکانی ئەو کەسانی لە مانگی نۆ دا لەدایك بوون:**

١- حەز بە شکستو کەوتنی کەسانی دی دەکەن.

٢- حەزیان بە تۆڵەسەندنەوەیە.

٣- دوودڵو ڕاڕان، حەزدەکەن درێژەی هەموو شتێك بزانن.

٤- هەستیارو دڵناسکن.

٥- پێوست دەکات کۆنترۆڵی خۆیان بکەن، لەو کاتانەی ڕەخنەیان لێ دەگیرێت.

٦- زۆر قورسە بەلایانەوە هەستو سۆزیان دەرببڕن.

٧- هەمیشە حەز دەکەن هەستەکانیان بشارنەوە.

٨- حەز بە فراوانیو شوێنی فراوانو کەلوپەلی گەورەو بەرفراوان دەکەن.

٩- ڕازیکردنیان سەختە.

بەو هیوایەی بتوانین سیفەتە نەرێنییەکان بگۆڕین بە سیفەتی ئەرێنی..

بە زانایەکیان گوت: تۆ چۆن توانیت ببیت بە خاوەنی ئەو هەموو سیفەتە جوانە؟

لە وەڵامدا گوتی: سەیری خەڵکم کرد، هەر سیفەتێکم بینی لە خەڵکیدا ناشیرین بوو، خەڵکیش بە ناشیرین وەسفیان دەکرد، منیش خۆم لەو سیفەتە دارنیو خۆم بەدوور گرت لێی..

هاوکات هەر سیفەتێکم بینی لە خەڵکیدا جوانەو خەڵکیش بە جوانو ناوازە وەسفی دەکات؛ ئەوا منیش هەوڵم داوە ئەو سیفەتە لە خۆمدا جێبەجێ بکەم، کەواتە: با ئێمەش لە سیفاتە ناشیرینەکان خۆمان بەدوور بگرینو هەوڵی گۆڕینیان بدەین، هاوکات برەو بە سیفاتە باشەکان بدەینو زیاترو باشتریان بکەین، ئەو کات دەبین بە کەسێکی بەسوود بۆ خۆمانو کۆمەڵگەکەمان!




# هەیاس چۆن بووە قازی

خەلیفەی پێنجەمی ڕاشدین (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) هەواڵی نارد بۆ فەرمانڕەوای بەصرە (عەدی کوڕی ئەرتات)و پێی گوت: بانگهێشتی هەر دوو زانا "هەیاسی کوڕی موعاویەو قاسمی کوڕی ڕەبیع" بکەو هەڵسەنگاندنێکیان بۆ بکەو بزانە کامیان لەوی دیکە لێهاتووترو بەتواناترو بەئەزموونترە، بیکە بە قازی شاری بەصرە، ئەمەش بەرنامەی ئەو کاتی خیلافەت بوو، بۆ هەڵبژاردنی قازی شار..

بۆ ڕۆژی دواتر، فەرمانڕەوای شاری بەصرە، بانگهێشتی هەردوو زانا (هەیاسو قاسم)ی کرد، بۆ کۆشکی فەرمانڕەواو بەمشێوەیە، هەڵسەنگاندنەکە بەڕێوەچوو، (بەپێچەوانەی نەریتی ئێستا، هەر یەك لە زانایان خۆیان لە پۆستو پلەوپایە دەدزییەوەو دەیانویست ئەوی دییان وەری بگرێت، واتە: شەڕ لەسەر پۆست نەبوو، بەڵکو شەڕ لەسەر وەرنەگرتنو ڕەتکردنەوەی پۆستەکان بوو)، کاتێك هەر دوو زانا، زانییان بە مەبەستی بوون بە قازی بانگهێشتی کۆشك کراون، سەرەتا قاسمی کوڕی ڕەبیعە دواو گوتی: هەیاس زۆر لە من تێگەیشتووترو فەقیهترەو لە من زاناترە بە کاروباری قەزاوەت، ئەگەر درۆ بکەم؛ ئەوا نابێت نییە تۆ کەسێکی درۆزن بکەیت بە قازی، ئەگەر ڕاستیش بکەم، پێویستە قسەکەم قبووڵ بکەیتو هەیاس بکەیت بە قازی! لەگەڵ ئەوەشدا قاسم سوێندی خوارد، کە ڕاستی گوتووە!

هەیاس وەڵامی دایەوەو بە فەرمانڕەوای گوت: تۆ پیاوێکت هێناوە لەسەر لێواری دۆزەخ ڕات گرتووە، بە سوێندێك خۆی لەو دۆزەخە ڕزگار دەکات، دواتر داوای لێخۆشبوون لە خودای گەورە دەکات، لەوەش کە لێی دەترسێت، ڕزگاری دەبێت!

عەدی گوتی: تۆ لە قسەکانی تێگەیشتیت، کەواتە: تۆ شایەنیت ببیت بە قازی! لەبەرئەوە داوای لێکرد ببێت بە قازی بەصرە.. بەڵام هەیاس ڕەتی کردەوە، هەیاس کاتێك زانی قاسم نایەوێت، ببێت بە قازی، ڕێچارەیەکی دیکەی گرتە بەر، ڕووی کردە والی بەصرەو گوتی: (بەکیر) لە من چاکترە، فەرمان بکە؛ تا ئەو ببێت بە قازی.. فەرمانڕەوای بەصرە فەرمانی کرد کە بانگهێشتی "بەکیر" بکەن، بۆ کۆشك، بەکیر هاتو بابەتەکەیان بۆ باس کرد، ئەویش ڕەتی کردەوەو گوتی: هەیاس لە من چاکترە، بۆ ئەو پۆستە!

ئامادەبووان گوتیان: هەیاس پێشتر گوتی، کە تۆ لەو چاکتریت!

هەیاس گوتی: ئەگەر فەزڵی ئەوتان بزانیایە؛ ئەوا بە دڵنیاییەوە فەزڵی ئەوتان بەسەر مندا دەدا؛ ئەوا پێویست بوو کە بزانن ئەو چاکترە لە من.

بەڵام هەمووان دەیانزانی، کە هەیاس شیاوی ئەو پۆستەیە، لەبەرئەوە ڕەتیان دەکردەوە..

کۆبوونەوەکە کۆتایی پێهات، بە بەخشینی پلەی قازی بە هەیاسی خاس، هەیاس دەستی بە گریان کرد، لەبەر ئەو بەرپرسیارێتییە قورسەی کەوتە سەرشانی، لەبەر ئەو ئەمانەتەی کەوتە گەردنی، ئیدی بەناچاری دەستەکانی بۆ ئاسمان بەرزکردەوەو گوتی: خودایە یارمەتیم بدەو سەرکەوتووم بکە لە کارەکانمدا.

لە ڕاستیدا قەزاوات فەهمو تێگەیشتنە.. نەك زانستو زانیاری، هەروەکو قازی هەیاس دەڵێت: کاتێك پیاوێك هات بۆ سەردانم، بە مەبەستی ڕاوێژکردن بۆ وەرگرتنی پۆستی قازی.. واتە: دەیویست فێری کاری دادوەری ببێت.. بە قازی هەیاسی گوت: فێری دادوەریم بکە؟

هەیاس گوتی: قەزاوەت زانست نییە؛ تا بتوانی فێری ببیت، بەڵکو تێگەیشتنە، بەڵام دەتوانیت بڵێی فێری زانستم بکە؛ چونکە دەکرێت زانست بەدەست بهێنرێت، بەڵام تێگەیشتن بریتییە لە توانای قازی بەسەر فیقهی واقیعو کاروباری خەڵکیدا، قازی دەبێت مرۆڤی ڕاستگۆ لە درۆزن جیا بکاتەوە، ڕاست لە ناڕاست جیا بکاتەوە، دادپەروەری بەرقەرار بکاتو حوکم بە شەریعەتی خودا بکات، هەروەها یەکێکی دیکە لە خاڵەکانی دادوەر ئەوەیە، کە نابێت قازی پڕوپاگەندەی خەڵکی کاری تێبکات، یاخود لە ئێستادا نابێت دادوەر گوتەو قسەی خەڵکی سەبارەت بە کێشەو ڕووداوەکان، یان ئەو شتانەی لە گۆڤارو ڕۆژنامەکان، یان ئەو قسانەی لە ڕادیۆو تەلەفزیۆنەکانی ئەم سەردەمەدا دەگوترێت، کاریگەری بەسەر بڕیارەکانی قازییەوە هەبێت.

هەروەها هەیاس ئامۆژگاری کردو گوتی: پێویستە لە کاری قازێتیدا ئەوە بزانیت، کە شوێن قسەی خەڵکی نەکەویت.

ڕەحمەتی خودا لە هەیاس؛ بەڕاستی پێکاویەتی!

# وەڵامی بەجێ

بیاوێک هات بۆ لای شەعبی و بێی گوت:

هاوسەرگیریم کردووە لەگەڵ ئافرەتێکدا، ئێستا دەیبینم شەلە، کە پێشتر نەمزانیوە، ئایا دەتوانم بیگێڕمەوەو دەستی لێ هەڵگرم؟

شەعبی گوتی: ئەگەر دەتەوێت پێشبڕکێی لەگەڵدا بکەیت، بەڵێ!

گەنجێك بە لای کۆڕی زانایەکدا تێدەپەڕێت، دەبینێت، زاناکە وانە بە فێرخوازەکانی دەڵێتەوە. بە توانجەوە دەڵێت: مامۆستا خەڵك گەیشتە سەر مانگ، تۆ هێشتا هەر باسی دەستنوێژگرتن دەکەیت بۆ فێرخوازەکانت!

مامۆستاکەش لە وەڵامدا دەڵێت: کوڕم تۆ نە گەیشتیتە سەر مانگو نەفێری دەستنوێژەکەی ئێمەش بوویت!

ئیبلیس گوتی:

سەرم سوڕماوە لە مرۆڤ، گوتیان: بۆچی؟

گوتی: خودایان خۆش دەوێتو سەرپێچی فەرمانەکانی دەکەن، ڕقیشیان لە منەو گوێڕایەڵیم دەکەن!

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز:

وەفدێك هات بۆ لای عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، کە چەندین ڕدێنسپیو پیاوماقووڵیان لە ناودا بوو، بەڵام منداڵێك بە نوێنەرایەتیی وەفدەکە هەڵساو دەستی بە قسەکردن کرد.. خەلیفە عومەر گوتی: کوڕم با کەسێکی گەورە قسە بکات!

منداڵەکە گوتی: ئەگەر لێهاتوویی و زانست بە تەمەن بووایە؛ ئەوا تۆ لەسەر ئەو کورسییە نەدەبووی؛ چونکە کەسانی لە تۆ بەتەمەنتر هەن!

خەلیفە گوتی: فەرموو، ئێستا قسە بکە!

# گۆرانی بڵێ بۆ ژیان

له ساته دژواره‌كاندا، با دڵت به‌هێزبێت، ئه‌گه‌ر له لێواری مه‌رگیش بوویت؛ چونكه چرا ڕووناكییه‌كه‌ی په‌خش ده‌كات، تا ده‌كوژێته‌وه، شێری برینداریش، تا ده‌مرێت، ده‌زانێ چۆن بنه‌ڕێنێ!

سه‌مۆئیل هاناجید- شاعیر

ساته سه‌خته‌كان خۆ ناده‌ن به ده‌سته‌وه، ئێمه‌ش هه‌رگیز خۆمان ناده‌ین به ده‌سته‌وه. میردل لو- نووسه‌رو چالاكوان

حه‌تمه‌ن له ژیاندا هه‌ندێجار تووشی شكست ده‌بیت، به‌ڵام ئه‌گه‌ر ئه‌وه ڕووی دا، هه‌وڵ بده به شێوه‌یه‌كی ڕاست شكست بێنیت.

كیسی ستینگڵ- ڕاهێنه‌ری وه‌رزش

چێژ له هه‌موو چركه‌ساته‌كانی ئه‌مڕۆت وه‌رگره‌و نیگه‌رانی سبه‌ی مه‌به! د. عادل شێخانی. مامۆستای زانكۆ

مادام گۆی زه‌وی به ده‌وری خۆیدا ده‌ســووڕێته‌وه، ئێمه‌ش به‌رده‌وام سه‌رمان به گێژه‌وه دێت‌و هه‌ڵه ده‌كه‌ین!

میل برۆكس. ده‌رهێنه‌ری سینه‌مایی‌و ئه‌كته‌ری كۆمیدی





# بزانە کام لەمانەیت؟

ئا: ئازاد محەممەد بەرگرکەیی

* وەکو مانگی چواردە دەدرەوشێیتەوەو چاوئێشیش دەتبینێتو کەس ناتوانێت نکۆڵیت لێ بکات، یاخود وەکو مانگی یەك شەوەیت، زۆر بەئەستەم دەبینرێیت، مەگەر بەتەلەسکۆبو جیهازی ئەلیکترۆنی نەبێت.

* وەکو هەنگ وایت، کار لەسەر خاوێنی دەکەیتو تەنها پاکی هەڵدەمژیت، یاخود وەکو مێشەرەشکەی تەنها کار لەسەر پیسی دەکەیتو تەنها لەسەر برینو پیسایی دەنیشیت.

* وەکو دارێکی پتەویت، کە ڕەگوڕیشاڵی بە زەویدا داکوتابێتو باوبۆرانو زریانیش نەتوانێت بەئاسانی هەرەست پێ بهێنێتو هەڵت بتەکێنێتو وشکت بکات، یاخود وەکو نەمامی یەك ساڵەیت، مەگەر دارێکی لەتەك بۆ بچەقێنیت، ئەگەرنا، هەر زوو دەلەقێیتو دادەڕمێیتو دەشکێیتو وشك دەبیت.

* وەکو دەریایت، کە بەئاسانی شێلو نابیتو ڕەنگت ناگۆڕێتو شت هەڵدەگریت، یاخود وەکو مەنجەڵی شیری، هەر بەئاگرێکی کەم، هەڵ دەچیت، ڕۆدەچیت بە زەویدا.

* وەکو ئەسفەنجیت، شتەکان لەناوەخۆ هەڵبگریتو بەرگەی بەربەستەکانو ئازارەکان بگریتو نهێنییەکان هەڵبگریتو بیپارێزێت، یاخود وەکو ئەشکەوتیت، هەرچییەکت بۆ باسکراو درکێنرا، ڕاستەوخۆ ئەی دەیەوەو ئاشکرای دەکەیت.

* وەکو داری بەردارو شەنگەبی وایت، کە لقو گەڵاکانت شۆڕ کردبنەوە بۆ زەویو خاکییەتیت نواندبێت، یاخود وەکو داری سپیدارو چنار وایت، کە سەرت بۆ ئاسمان بەرز کردووەتەوەو خۆت نمایش دەکەیت بەسەر دەوروبەرتدا.

* وەکو زەڕافەیت، ملت بەرزبێت هەستی سەرکەوتنت تێدابێتو هەمیشە بەرزو بڵند دەڕوانیت، یاخود وەکو مراویت، سەرت هەمیشە نزمەو ئومێدت کەمەو هەستی پێشبڕکێو سەرکەوتنت نییە.

* وەکو ئاوی بەربەستەکان دەشکێنیت بەبێدەنگیو هەرەس بەهەرچی پیسو پۆخڵە دەهێنیتو بەهێزتر دەبیت لە کاتی گەیشتن بە ئاوی دیکە، یاخود وەکو بەردی ڕەقیت لە کاتی گەیشتن بە بەردێکی دیکەدا، وردو خاش دەبیتو سەنگو قورسایی لەدەست دەدەیت.

*وەکو ئاوێنەیت، شتەکان وەکو خۆیان پیشان دەدەیت، بێ کەمو زیاد، یاخود وەکو زەڕەبینو قۆقزیت، شتەکان لە قەبارەی خۆی گەورەتر دەکەیتو کێشەکان زەق دەکەیتەوە.

* وەکو ماسیحەو لاستیکیت، تەنها هەڵەکان ڕەش دەکەیتەوەو لا دەدەیت، یاخود وەك ڤایرۆسیت، هەموو شتەکان بە جارێ ون دەکەیتو باشو خراپ پێکەوە لەناو دەبەیت.

* وەکو مۆمو ڕووناکیت بۆ شەوی تاریك، دەوروبەرت ڕووناك دەکەیتەوەو خۆت دەسووتێنیتك لەپێناو ڕووناکی خەڵکیدا، یاخود وەکو خۆڵبارانو دوکەڵیت، ڕۆژی ڕووناك، تاریكو تەنگ دەکەیت.

* وەکو هەموو ئەو شتانەیت، کە پێش هەموو کەسێك هەوڵی پۆشتەکردنی خۆت دەدەیت، دوایی هی دەوروبەر، یاخود وەکو دەرزیت، کە خۆت ڕووت بیتو هەوڵی پۆشتەکردنی خەڵکی بدەیت.



# عیشق تاکە چارەیە

فێنك جەمال

کاتێك کە عیشق ئامادە دەبێت، هەموو کێشەیەك چارە دەبێت، هەموو بەربەستەکان دەتوێنەوە، گشت بێزارییەکان خۆشی دەپۆشن، سەراپای کەشو هەواکان، ئەرێنی دەبن.. هەڵسووکەوتەکان نموونەیی دەبن، درۆو بەغیلیو... هتد، سەرهەڵدەگرن، نائومێدی بوونی نامێنێت، پێکەنینیان بەسەردا دەبارێت.. دونیا پەڕەی گوڵی بەسەردا دەبارێتو جگە لە دەنگی خوڕەی ئاوو پێکەنینی خۆشحاڵی، دەنگی دی نابیستین، ...

دەزانی عیشق تاکە شتە، تا ئێستا توانیبێتی دوو کەسی سەراپا لێك جیاواز، نەدیوو نەناس پێکەوە لە ماڵێکدا کۆ بکاتەوەو بڕیار بدەن؛ تا کۆتایی ژیانیان بۆ بەختەوەری یەکدی بژین، لە ئەنجامی ئەم عیشقەدا دیانەوێت کۆپییەك درووست بکەن کە تێکەڵەی هەردوکیان بێت!! ئاخر بڕیاردانی درووستکردنی ئەم کۆرپەلەیە، دەیسەلمێنێت کە ئیدی عیشق گەیشتووەتە لوتکەو چارەیەك نییە بۆ کەمکردنەوەی..

کەواتە؛ گەر هەریەکێکمان تۆزێك عیشقمان بۆ هەموو شتێکی دەوروبەرمان هەبوایە، ژیانێکی زۆر جیاوازو مێشکێکی داهێنەرانەو دڵێکی میهرەبانترمان دەبوو.

بەڵام کاتێك وشەی عیشق دێتە ناو باس، زۆربەمان عیشقو خۆشویستنی دوو ڕەگەزی بەرامبەرمان بە خەیاڵدا دێت!

کە ئەوە مانای بچووککردنەوەی وشەی عیشقە!!

ئێمە عیشقمان بۆ دەوروبەر، شتێکە کە هەرگیز نایبیستین، بۆیە لە باسی عیشقدا، بە مێشکماندا نایەت، باسی گرنگی عیشقو پێزانین بکەین بۆ دەوروبەرمان؛

لەسەرەتای هەموو شتێکەوە، وا باشە لە خۆمانەوە دەست پێبکەین؛

**عیشقمان بۆ مرۆڤ؛** بۆ هەموو تاکێك بەبێ گوێدانە ڕەگەز، نەتەوە، ئاین...، ئەوا جوانییە ڕاستەقینەکەی یەکدیمان بۆ دەردەکەوێتو دەزانین مرۆڤ چەندە بڵندە! چەندە باڵایە!!

بێ یەکدی ژیان چەندە بێمانایە، لەوانەیە تا لە یەکدی دوور نەکەوینەوە، هەستی پێنەکەینو گرنگی ئەم کەسانەی دەوروبەرمان هەر لە خێزانەکەمانەوە، تا دراوسێو هاوڕێو هاونیشتیمانیەکانمان.

**عیشقمان بۆ ئاژەڵەکان:** گەر هەر یەکە لە ئێمە هیچ ئاژەڵێکیشی خۆش ناوێت، ئەوا لایەنی کەم با ئازاریان نەدات، بەڵام سەیرەکە لەوەدایە زۆرینەی ئەوانەی شەڕ بە ئاژەڵەکانیان دەکەنو دەیاندەن بە کوشت، زۆریان خۆش دەوێن، باشە ئەی ئەگەر ئارەزووی ئاژەڵیان نەبوایە، چیان لێدەکردن؟!!

گەر ئیدی هێندە ئەزییەتیان نەدەینو ڕاویان نەنێینو هیچ نەبێت یارمەتیان بدەین، لە هەر ڕوویەکەوە بێت.. ئەوا بە جۆرێ ئاشت دەبووینەوە، کە چیدی لەوپەڕی کۆڵانەکەوە لە ترسمان ڕایان نەدەکرد، بەڵکو هەستیان بە ئازادی پیاسەکردن دەکرد.

**عیشق لەگەڵ ژینگەو ئاوو زەویی؛**

پاکوخاوێنیی ژینگە، ئەو وشە کۆنەی کە چەندان ساڵە دەوترێتەوەو دەگوترێتەوە، بەڵام حەز دەکەم بڵێم ئیدی بەسە تەواو بۆ هەستنەکردن بە بەرپرسیارێتیو پێنەزانینی ئەو خاکەی لەسەری دەژیت، ئاخر لەبەرچی تۆ ژینگە پیس دەکەیتو کەسێکی دیکە پاکی بکاتەوە؟!

گەر ئیدی بڕیار بدەین، لانی کەم هیچ شتێك فڕێ نەدەینە شوێنی نەگونجاو، ئەوا ڕوخسارو بۆنو ڕەنگە جوانەکەی زەویو ژینگەمان هەست پێ دەکرد، بە جۆرێ دەمانگوت کە چرکە ساتەکان لەبەر خاتری گەیشتنی ئێمە بە ئامانجەکانمان دەسووڕێتەوە. خوڕەی ئاومان بە شێوەی قاقای پێکەنین دەبیست، کە چەندە خۆشحاڵهم بڕیارمان داوە لە خۆشەویستیدا، هەموو پارچە زەوییەك، وەکو ئەو بەشەی لێی دەخەوین، خاوێن ڕاگرینو بە دڵۆپیش ئاو بەفیڕۆ نەدەینو بۆ هەتاهەتایە ئاشت بینەوە!!

بەڵێ، با ئیدی لەگەڵ ئەو شتانە ئاشت بینەوە، کە عاجزمان کردوون، بێئەوەی هەستی پێبکەین!

عیشق فلتەرێکو ئەنزیمێکی زراوە، کە هەموو وشەو هەڵسوکەوتو بیرۆکەکان دەپاڵێوێتو تەنها باشەکان دەهێڵێتەوە، بە یەك دڵۆپیش لە ئەنزیمەکەی، هەموو خراپەکان دەتوێنێتەوە.

هەروەکو د. ئیبراهیم فەقێ دەڵێت؛

لە چرکە ساتەکانی ژیاندا، چێژ ببینە، لەو ڕێگایەی بەسەریدا دەڕۆیت، لە ڕێڕەوی ژیانتدا، لە فاریزە سوود وەربگرە، بەڵام لە خاڵ بەدوور بە.

چۆن ئاو شێوەی دەفرەکەی دەگرێت، ژیانی تۆش شێوەی بیرو بۆچوونەکانتو هەڵسوکەوتەکانت دەگرێت!!

# میهرەبانی، زمانی ئاسمانو کلیلی دڵەکان

زاهیر زانا

کاتێك هەوا سارد دەبێتو لەسەرمادا لەشت دەلەرزێت، چی دەکەیت؟ ئایا وەکو ڕۆژانی هاوین، جلو پۆشاکە زیادەکانت دادەکەنیتو سپلێتو پانکەو موبەریدە ئیش پێدەکەیت؛ تا زیاتر سەرمات ببێت؟!

واتە: بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سەرما، سوود لە سەرما دەبینیت، یان بەپێچەوانەوە بەرەو هۆکاری گەرمکردنەوە دەڕۆیت؛ تا خۆت گەرم بکەیتەوە، زۆر ڕوونە کە باشترین کار، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سەرما، خۆگەرمکردنەوەیە.

کاتێك گەرممان دەبێتەوە، سەرما نامێنێتو کاریگەری لەسەر ئێمە نامێنێت، سەرما شتێك نییە، جگە لە نەبوونی گەرما...!

با پرسیارەکە بەجۆرێکی دیکە بڵێینەوە: ئەگەر دونیا تاریك بێت، ئیدی خۆر نەتوانێت، دونیا ڕووناك بکاتەوەو تەنها یەك چرای لاواز لە ماڵەکەتدا هەبێت؛ بۆئەوەی ڕووبەڕووی تاریکی ببیتەوە، ئایا چرا لاوازەکە کزتر دەکەین؟

واتە: بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی تاریکی، تاریکی زیاتر دەکەین، یان چراو گڵۆپو ڕووناکی زیاتر دادەگیرسێنین؛ بۆئەوەی دونیا ڕۆشنتر ببێتەوە! بە دڵنیاییەوە باشترین شت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی تاریکی ئەوەیە، ڕووناکییەکان زیاد بکەین، کاتێك ڕووناکی زیاتر ببێت، خۆبەخۆ تاریکی کەم دەبێتەوەو ئیدی تاریکی ئێمە ناترسێنێت، تاریکی شتێك نییە، جگە لە نەبوونی ڕووناکی...

مرۆڤە میهرەبانەکان، ئاسوودەترین مرۆڤەکانی سەر ڕووی زەوینو هەمیشە شیلەی بەختەوەرییان لێ دەتکێت، بەجۆرێك ئەوانەش کەلێیان نزیکن، هەست بە دڵارامیو ئاسایش دەکەن، ئەوەی گرنگیشە، ئەوەیە فێری میهرەبانی ببینو دونیا تەنها لە پەنجەرەی خۆشەویستیو میهرەبانییەوە سەیر بکەینو لە جێگەی زیادکردنی ڕووبەرە تاریكو ساردوسڕەکان ڕووناکیو گەرمایی پەخش بکەینەوە.

سەرما شتێك نییە، جگە لە نەبوونی گەرما، کاتێکیش گەرما هات سەرما کۆچو باری دەپێچێتەوەو تاریکیش هیچ نییە، جگە لە غیابی ڕووناکی، کاتێکیش ڕووناکی بێت، تاریکی ئاسەوارێکی لێ نامێنێتەوە.

شەڕو خراپەکاری، شتێك نییە جگە لە نەبوونی میهرەبانیو چاکەکردن، کاتێك عیشقو موحیبەت پەیدا ببێت، شەڕو خراپە جگە لە ڕاکردنو لەناوچوون، ڕێگایەکی دیکەیان نییە، ئەمە ڕاستەقینەیەکەو ئەگەر مرۆڤەکانی سەر ڕووی زەوی بیزاننو پەیڕەوی بکەن، جەنگو ناکۆکی بۆ هەمیشە دەوەستنو مرۆڤە خراپەکارەکان، چیدی مەیدانێکیان بۆ خۆنواندن نامێنێت.

ئایا تێبینیتان کردووە لە هەر شارێکدا، شەقامێك، یان چەند شەقامێك، چایخانەیەك، پارکێك دوای عەسر جێگەی کۆمەڵێك



کەسی هاوشێوەیە؟ مرۆڤگەلێك کە لەو شوێنو کاتەدا دەبینرێن بەهەمان شێوازو ستایلەوە دێنو دەچن، یان دانیشتوون.

تائێستا پرسیارت کردووە: بۆچی مرۆڤەکانی هەر شەقامێك، یان چایخانەیەك، یان پیشەیەك لەیەك دەچنو جگە لەچەند کەسێکی کەم نەبێت، ئەوانی دی لە جلوبەرگو خۆگۆڕینو ڕەفتاریاندا هاوشێوەن؟

بێگومان وەڵام دەدەیتەوە، کە ئەم بابەتە شتێکی ئاساییەو هەر گەڕەكو شوێنو پیشەیەو شێوازی خۆی هەیە، قسەکە لێرەدایە، ئەگەر کەسێکی غەریبو جیاواز، کەسێك کەلە جلو بەرگو شێوەدا لەوان ناچێت، بەهەمان شوێندا تێپەڕ ببێت؛ ئەوا زوو هەست بە غەریبیو جیاوازیی خۆی دەکاتو ناچارە، یان شێوەی خۆی بگۆڕێت، یان هەرچی زووە، لەو شوێنە بڕوات!

ئەم بابەتە بۆ ئەو کەسانەی دەچنە وڵاتانی دیکە هەمان ڕاستی تێدایەو ئەگەر ئەوان بیانەوێت، هەمان هەڵسوکەوتی وڵاتانی خۆیان بکەنەوە؛ ئەوا دوو ڕێگا زیاتریان لەبەردەستدا نییە، یان دەبێت بچنە شوێنێكو لەگەڵ ئەو کەسانەدا بژین، کە هاوبیرو هاو ڕەفتاریانن، یان دەبێت بەشێوەیەك بژین، کە گۆشەگیر بنو کەمتر لە شوێنو تێکەڵی ئەوانی دی نزیك ببنەوە...یان ناچارن وەکو ئەوان بژینو واز لە زۆرێك لەکولتوورو خوو نەریتەکانی خۆیان بهێنن، ئەگەرنا بەئاسانی شوێنو جێگەیان نابێتەوە.

ئەم ڕوونکردنەوەیە بۆئەوە بوو؛ تا نهێنیی سەرکەوتنی کەسانێك بزانین، کە تەنها زمانی میهرەبانی زمانیانە، ڕەنگە زۆرکەسیش بڵێن، کە میهرەبانی بوون، وا دەکات بەئاسانی ببین بە قوربانیو نێچیری کەسانێکی نامیهرەبانو شەڕانگێزو بەپێچەوانەوە میهرەبانبوونمان بەدەرفەت بزانن؛ تا هەلپەرستانە مامەڵەمان لەگەڵدا بکەن. ئەم ڕستەیە، وەکو ئەوە وایە بڵێین: (چرا) دەبێت دوو وەزیفەی هەبێت، یەکێکیان بۆ پەخشکردنی ڕووناکیو ئەویتریش بۆ پەخشکردنی تاریکی!

واتە: هەرکاتێك تاریکی زیاتر بوو؛ ئەوا چرای تاریکی دابگیرسێنینو بۆ هەر ژوورێکی تاریكو بێپەنجەرەو ڕۆشنایی چرایەکی تاریکیمان پێ بێت؛ بۆئەوەی هەرکات تاریکی زیاتر بوو، ئێمەش چرای تاریکی ڕۆشن بکەینو تاریکی پەخشو بڵاو بکەینەوە؛ بۆئەوەی لەبەرامبەر تاریکیدا، هەست بەکەمیو لاوازی نەکەین!

زۆرکەس بێئاگان کە بە بوونی ڕۆشنایی. ئیدی تاریکی توانای هەبوونی نییەو کاتێك ئێمە میهرەبانی بفرۆشین، ئیدی کڕیارێك بۆکڕینی خراپیو شەڕو بەڵا، بوونی نییە.

کەسێك کە بەرامبەر ئێوە خراپە دەکات، ئێوە لەبەرامبەردا ئاشتیو میهرەبانی دەنوێننو بە ڕێگای خۆتاندا دەڕۆنو تەسلیمی یاریو فێڵەکانی ئەوان نابنو لە گۆڕەپانی ئەوداو بەشێوەی ئەو ڕەفتار ناکەن؛ ئەوا ڕێك وەکو ئەوە وایە، کەسێك لە کۆڵانو شەقامێکی دیکەوە، بە جلوبەرگی سەیروسەمەرەوە، هاتووەتە کۆڵانەکەی ئێوەو لە کۆڵانی ئێوەدا غەریبو نامۆیەو هیچ کەس دۆستایەتی ناکات، ئەویش ناچارە، کە یان وەکو ئەوانی دی ببێت بە مرۆڤێکی میهرەبانو دۆستایەتیو خۆشەویستی بکات بە پیشەی، یان دەبێت دوور بکەوێتەوەو بچێتە شوێنێك، کە هاوڕێو هاوڕەفتاری وەك خۆی بدۆزێتەوە.

کەسێك کە میهرەبان بێت، زمانی خراپەو شەڕ نازانێت، ئەمە بەو واتایە نییە، کە ئاگای لە خۆی نییەو بەسادەیی لەلایەن خراپەکارانەوە دەخڵەتێت، بەڵکو ئەو هەرگیز سەوداو مامەڵە لەگەڵ ئەواندا ناکات؛ چونکە لە بنەڕەتەوە، فێر نەبووە لەگەڵ ئەواندا هەڵسوکەوت بکاتو بەشداری لەگەڵ خراپەکانیاندا بکات.

ئێوە وای دابنێن، کەسانێك حەسوودی بەتواناو کەسێتیی ئێوە دەبەنو قسەگەلێك دەڵێن؛ بۆئەوەی ئێوە لەکەدار بکەنو ساردتان بکەنەوە لە ڕێگەکەتان، ئەی ئەگەر ئێوە بەزەردەخەنەوە بابەتەکەی ئەو وەربگرنو لەسەرکاری خۆتان بەردەوام بن، دەزانن چ زیانێکی سەخت بە ڕەفتارو کەسێتیی کۆمەڵایەتیو ڕۆحیو دەروونیی ئەو دەگەیەنن! ئەو حەسوودی بە کەسێك دەبات، کە ئەو کەسە تەنانەت ئەو هەر نابینێت، کاری ئەو کەسە وەك ئەوە وایە، کەسێك بیەوێت ئاو لە مشتەکانیدا کۆ بکاتەوە، ئەو هەرچەندە دەستو پەنجەکانی توند بکات، ئاوەکە لەم لاو لای دەستییەوە دەڕژێتو هیچ لە نێوان دەستەکانیدا نامێنێتەوە.

هەربۆیە هەمیشە زمانی میهرەبانی بزانەو هەرکاتێك چاکەیان لەگەڵداکردیت، بە چاکە وەڵام بدەرەوە، هەرکاتێکیش خراپەیان لەگەڵداکردیتو خراپەیان لەگەڵدا گوتی، تۆ بەهەمان شێوە، ڕەفتار مەکە، وەك کەسێك ڕەفتار بکە، کە لە بنەڕەتەوە لەو زمانەی ئەو تێناگەیت، مەڵێ دەتوانم وەك ئەو بم، بە خۆت بڵێ خراپە نازانمو نەمویستووەو نامەوێت خراپە فێر ببمو تەنها چاکبوونو میهرەبانبوون فێربوویت، هەرگیز ئاگر بە ئاگر ناکوژێتەوە، بۆ کوژاندنەوەی ئاگر، پێویستمان بە ئاوە.. مرۆڤی میهرەبان، باش ئەو ڕاستییە دەزانێت، کە ناکرێت بەرامبەر ڕەفتاری خراپ، بە هەمان شێوە وەڵام بداتەوە، ئایا دەکرێت (کاتێك سەگێك گاز لە کەسێك دەگرێت، ئەویش گازی لێ بگرێتەوە؟!!).

میهرەبانی موعجیزە درووست دەکات، بەمەرجێك بە خراپە تێکەڵو وابەستەو ئالوودە نەبێت، بەهەمان شێوەی کە ڕووناکی دێتو تاریکی دەڕەوێتەوە، کاتێکیش میهرەبانیو موحیبەتو دۆستایەتی دێتە مەیدان جێگایەك بۆ خراپەکاران نامێنێتەوە، یان خراپەکار دەبێت لە گۆشەیەکی تەنگداو بە گۆشەگیری بژی، ئەگەریش زۆر سوور بێت لەسەر ئەوەی لەتەنیشت مرۆڤە باشەکانەوە بە خراپەکاریی خۆی بەردەوام بێت، خۆبەخۆ لە نێوان باشەکاندا خۆی دەبینێتەوەو فرسەتێکی بۆ خراپبوون دەست ناکەوێتو وردە وردە ڕەنگی میهرەبانیو میهرەبانەکان دەگرێت.

هاوڕێ.. تەنها زمانی میهرەبانی بزانە، کاتێك تەنها میهرەبانی بزانیت، ڕۆشناییو موحیبەت بە چواردەورتدا پەخش دەکەیتو مرۆڤە خراپەکارەکان، ناتوانن لە نزیکی تۆ بمێنن؛ چونکە ئەوان پێویستیان بە هاوزمانی خۆیان هەیەو کاتێکیش تۆ تەنها زمانی میهرەبانی بزانیت، بە دەردی ئەوان ناخۆیتو بەکەڵکی ئەوان نایەیت، تۆش وردە وردە دەبینیت، لە چواردەوری خۆت تەنها مرۆڤی میهرەبان دەبینیتو لە چواردەورت مەوج دەدەن، تەنانەت ئەگەر مرۆڤی نامیهرەبانیش لێت نزیك ببێتەوە، ڕوخساری میهرەبانی پیشانی تۆ دەداتو ناچارە میهرەبانانە ڕەفتار بکات!

ئەوەی زمانی میهرەبانی بزانێت، پێویستی بەوە نییە تەنانەت فێری زمانی دی ببێت؛ چونکە زمان میهرەبانی، زمانێکە لە هەموو جێگەو شوێنێك خەڵك تێی دەگاتو تەنانەت ئاژەڵو باڵندەکانیش لە زمانی میهرەبانی تێدەگەن!! زمانی میهرەبانی، نەك تەنیا لەم دونیا، بەڵکو لە ئەو دونیاش، هەر گۆیایەو زمانی ئاسمانو زمانی فریشتەکانە.

# 10 زیرەکترین کەسێتی لەسەر ئاستی جیهان

**ئایا دەتوانین زیرەکیی مرۆڤ بپێوین؟ چۆن؟**

شتێکی بەلگە نەویستە، کە ئێمە ناتوانین زیرەکی بپێوین، وەك چۆن کیلۆیەك تەماتە دەپێوین؛ چونکە زیرەکی، شتێکی ماددی بەرجەستە نییە، بەڵکو ئێمە لە ڕێگای ڕەفتارەوە، دان بە بوونی دادەنێین. بۆیە دەروونزانەکان، هەندێك تاقیکردنەوەیان داهێنا بۆ پێوانی زیرەکیو ئەو تاقیکردنەوانە بریتین لە: چەند پرسیارێك کە لەو کەسە دەکرێن کە دەمانەوێت پلەی زیرەکی بپێوین، یاخود بریتین لە: چەند کردارێك، یان هەردوو جۆری تێدایە.

**IQ پێوەری زیرەکی:-**

IQ واتە: **Intelligenz-Quotient** دەستەواژەی IQ پێوەرێکی جیهانییە، بۆ زانینی ڕادەی زیرەکی بەکار دێت، نمرەیەکە وەرگیراوە لە یەکێك لە چەندین تێستی ستانداردی جیاواز بۆ هەڵسەنگاندنی ژیری. یەکەم پێوەری زیرەکی، لەلایەن دەروونزانی فەرەنسی ئەلفرێد بینێ و تیودۆر سیمۆن لە ساڵی ١٩٠٥ دانرا، پاشان بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩١٢ وەکو شێوازێکی IQ چەندان پێوەری دیکەی زیرەکی داهێنراون، بەڵام زاراوەی پێشنیارکراوی نوێ، بۆ نمرەدانان بە تێستەکانی ژیریی منداڵان کە پێشتر لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمەوە پەرەیان گرتبوو، لەلایەن دەروونزانی ئەڵمانی ویلیام ستێرنەوە دانرا.

پێکهاتووە لە چەند پرسیارێك، یان چەند کردارێك لە ڕێگەیەوە تەمەنی تاقیکرنەوەی زیرەکیی عەقڵی دەستنیشان دەکرێتو دابەشی تەمەنی زەمەنی مرۆڤ دەکرێتو ئەنجامەکەی لە ١٠٠ دەدرێت، بەم شێوەیە دەتوانین ئاستی زیرەکیی تاکەکان بزانین، واتە: ئەوەی نیشانەکانی لە دەوری (٩٠-١١٠) بێت خاوەنی عەقڵێکی مامناوەندیو ئاساییە، کە لە ٥٠٪ی خەڵکی نیشانەکانیان لەم پلەیەدایە، ڕێژەی زیرەکی لە نیشانەکانی نێوان (٦٨-٩٠) زیرەکیی کەمو پلەی خوار (٦٨) ئاستی ژیری دواکەوتوو هەژمار دەکرێنو ڕێژەی (١١٠)بەسەرەوە خاوەنی زیرەکییەکی بەرزنو کۆتا ڕێژە کە لە تاقیکردنەوەکە دەستنیشان دەکرێ سەرووی پلەی (١٤٠)ـە، کەسانێك هەن ئەم ئاستەیان تێپەڕاندووەو گەیشتوون بە بەرزترین ئاستی زیرەکی، زۆرن ئەوانەی ناوبانگیان دەرکردووە لە جیهان وەك: (بیل گەیتس، ستیف جۆبز، ئەحمەد زویل،



1

ئا: نارین جووتیار

گالیلۆ گالیلی، ئەدۆلف هتلر...هتد). زۆر کەسێتیی دیکەیش هەن، ناویان لە مێژوو تۆمارکراوە، بەڵام نازانرێت ئاخۆ ئەمانە زیرەکییان لە چ ئاستێکدا بووە، ئەوانەی گەیشتوون بە ئاستی زیرەکیی ڕاستەقینە، ١٠ کەسێتین لە سەر ئاستی جیهان، وەك زیرەکترینی کەسێتییەکانی جیهان دەستنیشان کراون کە بریتین لە:

**یەکەم: تیرینس تاو IQ 230 :-**

تیری زانای ماتماتیکی ئوستوڕالیایی، وەکو زیرەکترینی کەسێتییەکان دەستنیشان کراوە، بە پێی تاقیکردنەوەکە، نیشانەکانی زیرەکیی ئەو، دەگات بە ٢٣٠ پلە، ئەوەش بە بەراورد IQ جیهانی بۆ دیاریکردنی ئاستی زیرەکی لەگەڵ ئاستەکانی پێوانەی جیهانی زۆر زیاترەو زیرەکییەکەی لە بواری بیرکاریدایە، بە (موزارت الریاضیات) ناسراوە. تاو وەك پرۆفیسۆر لەبەشی ماتماتیك وانە دەڵێتەوە لە زانکۆی UCLA کالیفۆرنیا لە لۆس ئەنجلوس.!

**کورتەیەك لە ژیانی:** تیری لە ١٧ی یولیو ١٩٧٥ لە شاری ئیدیلید، لە باشووری ئوسترالیا لەدایك بووە، (بیلی تاو)ی باوکی، دکتۆری منداڵانو (گریس)ی دایکیشی، بڕوانامەی فیزیاو ماتماتیکی بووە، لە ساڵی ١٩٧٢ لە هۆنگ کۆنگی چین بەرەو ئوستڕالیا کۆچیان کردووە، دوو برای لەخۆی بچووکتری هەیە بە ناوەکانی (سناتریفۆر، نایجل)، تیری لە ساڵی ٢٠٠٢ ژیانی هاوسەری پێکهێناوە لەگەڵ ئافرەتێکی ئەمریکی بە ناوی (لورا) و خاوەنی دوو منداڵە بە ناوەکانی (ویلیام ١١ ساڵی، مادلین ٣ ساڵان) خاوەنی ڕەگەزنامەی چینیو ئوسترالیو ئەمریکییە، هەر لە منداڵییەوە جیاواز بووە لە منداڵانی هاوتەمەنی خۆی، هەر لە تەمەنی زووەوە توانایەکی لە ڕادەبەدەری هەبووە لە بواری ژمێریاری بۆ لەبەرکردنو زانینی ژمارەکانو شیکردنەوەیان، بۆیە لەگەڵ منداڵانی تەمەن ٥ ساڵی نێردراوە بۆ قوتابخانەی تایبەت، بەڵام دوای ٦ هەفتە لە قوتابخانە دەرهێنراوە، بەهۆی ئەوەی مامۆستاکان نەیانتوانیوە چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو منداڵەدا بکەن. «کین کلیمنتس»کە یەکێك بوو لەوانەی وانەی پێووتوەتەوە لەبارەی تاو دەڵێت: «کاتێ بۆ دوا جار لە قوتابخانە گەڕایەوە لە گۆشەیەکی ژوورەکەی دانیشتبوو کتێبێکی بەهێزی بە دەستەوە بوو دەیخوێندەوە لە ژێر ناونیشانی(حسێبی جیاکاریو تەواوکاری) کلیمنتس ئاشکراشی کرد کە هەر لە حەوت ساڵییەوە، پێناسەی کۆمەڵەکانو شیکردنەوەی (گرفتەکانی وێنەی بەیانی)ی زانیوە بە بەکارهێنانی (جیاکاری لە بیرکاریدا) زۆرجار پرسیاری لە دایکی کردووەو خۆشی زۆر بە دوای وەڵامەکاندا چووە.

**بڕوانامەکانی:**

تیرینس تاو هەر لە منداڵییەوە، خاوەنی توانایەکی زۆر بووەو وەکو قوتابییەکی بەهرەمەندو تایبەت بووە، دوای تاقیکردنەوەی لە تەمەنی ١٤ ساڵی لە زانکۆی فلندرز بەشی ماتماتیك لە ئوستڕالیا دەست بە خوێندن دەکات، لە تەمەنی ١٦ ساڵی بڕوانامەی بەکالۆریۆس بە پلەی نایاب وەردەگرێتو لە ١٩٩٢ بۆ خوێندنی ماستەر ڕوو دەکاتە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە زانکۆی برینستون لە نیوجیرسی لە تەمەنی ٢٠ ساڵیدا، بڕوانامەیٔ ماستەر بەدەست دەهێنێتو لە تەمەنی ٢٤ ساڵی بڕوانامەی دکتۆرا وەردەگرێت، بەمەش دەبێتە بچووکترین پرۆفیسۆر لە جیهاندا لە ڕووی تەمەنەوە. لە ساڵی ١٩٩٩ وەکو پرۆفیسۆری یاریدەدەر لە بەشی ماتماتیك لە «جۆزێف ڕودینك» ڕاگری کۆلێژی زانست لە زانکۆی کالیفۆرنیا لەبارەیەوە دەڵێت: (باشترین زانای بیرکارییە لە جیهاندا).

**تیۆرو لیکۆڵینەوەکانی:**

نزیکەی ٢٠٠ لێکۆڵینەوەی زانستی ئەنجام داوە، چەندین کتێبی نووسیوە، هەرچەندە کاتی پێویستی نییە بۆ نووسین زیاتر بەدوای دۆزینەوەو شیکردنەوەی پرسیارەکانو دانانی تیۆری جۆرییە لەبارەی بابەتەکانی (سنوور، زنجیرە، بەردەوامی، لێك جیایی، ریمانی تەواوکاری) و شیکردنەوەی خێراو بنچینەکانی دەییو بنچینەکانی خوێندن بۆ زیاتر چالاکبوونی خوێندکارانو پیادەکردن بۆ وەگەڕخستنی بیریانو نووسین بەوردی، لە ٢٠٠٦ تاو (هاوکێشەکانی پەرەسەندنی پەرت)ی بڵاو کردەوە کە تیۆرێکی ناوخۆییو جیهانییە، لەبارەی بابەتەکانی (هاوکۆکیی زیادە، تیۆری هەرەمەکیی ماتریکس، هاوکێشە بەشەکییە جیاکارییەکانو تیۆری ژمارەیی،ئەندازەی جەبری)و بە شیکردنەوەداهێنانکارییەکانییەوەبۆکێشە ئەستەمەکان ناوبانگی دەرکردووە، گرنگترینیشیان تیۆری (گرین تاو)ە.

**خەڵاتەکانی:**

چەندان پەڕاوو دیاریو خەڵاتو مەدالیای وەرگرتووە، لە تەمەنی ٩ ساڵیدا، بەشداری کردووە لە ئۆلۆمپیاتی جیهانیو توانیویەتی مەدالیای فیلدز بەدەست بهێنێت. لە ١٩٨٦ مەدالیای برۆنزی بە دەست هێناوە، ١٩٨٧ مەدالیای زیوی بەدەست هێناوە، لە ١٩٨٨ مەدالیای زێڕی پێ بەخشراوە، لە ساڵی ٢٠٠٦ خەڵاتی نۆبڵی پێ بەخشراوەو بە (موزارت الریاضیات) ناسێندراوە، هەروەها لە ساڵی ٢٠١٠ خەڵاتی مەلیك فەیصەلی وەرگرتووە.

**نهێنیی سەرکەوتنی:**

تاو لە باسی سەرکەوتنی خۆیدا دەڵێت: من هیچ توانایەکی جادووییم نییە، بەڵکو تەنها سەیری کێشەکان دەکەم، وەك ئەوەی لە پێشوودا بینیبێتمو شیکردنەوەم بۆی کردبێت، بەوەش بیرۆکەیەکت پێ دەدات بۆ ئەنجامدانی کارەکە، هەموو کارێکی گەورە لە بیرۆیەکی بچووکەوە دەست پێدەکات، ئەمە بە تەنها بەس نییە، بەڵکو دەبێت یاری لەگەڵ ئەو کێشەیەدا بکەیت، بەمەش بە تێپەڕبوونی کات زانستخواز دەبیت لەبارەی ئەو بابەتەوە.

زۆربەی زۆری خەڵکی، کێشەیان لەگەڵ بیرکاریدا هەیە، بەڵام تاو ڕاستەوخۆ شیکردنەوەی بۆ دەکات، هەتا ئەگەر لێی تێنەگاتو نەزانێت چی دەکات پێش بەرەو پێشبردنی هەر وردەکارییەك لەو بوارە، زۆر بەخێرایی شیکردنەوەیان بۆ دەکات، هەروەها دەڵێت: تا زیاترو زۆرتر لە بابەتێکدا قووڵ ببیتەوە، بیرۆکەی زیاترو زانیاریی زیاترت پێدەدات، هەتا ئەگەر پێشتر زانیاریت لەسەری نەبووبێت. هەروەها دەڵێت کە منداڵ بووم، خۆشەویستییەکی زۆرم بۆ بیرکاری هەبوو، ئەو خۆشەویستییە زۆرە، بوو بەهۆی ئەوەی بتوانم لە ماوەیەکی زۆرکەمدا، بتوانم کێشەی زۆر قورس شی بکەمەوە لە بواری ژمێریاریدا، لە خاڵێکەوە دەستم پێ دەکرد، تا ماوەیەکی زۆر بیرم لێی دەکردەوەو خەریکی دەبووم، تا کۆتایم پێ دەهێنا.

«تۆش بەم شێوەیە دەتوانیت سەرجەم کێشەکانت چارەسەر بکەیت لە ژیاندا، بەمەرجێك بە ئاشناییەوە لە بابەتەکە بڕوانیتو پشوو درێژ بیت، تا دەگەیتە خاڵی کۆتایی تەنانەت ئەگەر زانیاریت نەبێت لەبارەیەوە؛ چونکە بە تێپەڕبوونی کات، ڕێگاکانی گەیشتن بە چارەسەر دەدۆزیتەوە.

# عبدالرحمن الداخل

## ١١٣-١٧٢ کۆچی

بەرزان ئەبوبەکر

(عەبدوڕەحمانی کوڕی موعاویەی کوڕی هیشامی کوڕی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان)ە، لە ساڵی ١١٣ کۆچی لەدایك بووە، باوکی یەکێك بووە لە گەورەپیاوانو خانەدانەکانی ئومەوییەکان، دایکیشی ئافرەتێکی بەربەری بووە، لە نەسەبی بەربەر نەفزە بوو.

عەبدوڕەحمان هێشتا منداڵ بوو، باوکی بۆ هەمیشە جێی هێشتو ماڵاوایی لێکرد، باپیرەی هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك گرتییە خۆی.

### کۆتایی دەوڵەتی ئومەوی لە ڕۆژهەڵات:

بارودۆخی بنەماڵەی ئومەوی، دوای هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك تێکچوو، ئیدی لێرەوە بارودۆخی ئومەوییەکان تێکچوو، دەوڵەتو دەسەڵاتەکەیان ماڵاوایی کردو بۆ هەمیشە کۆتایی پێهاتو خۆری دەسەڵاتیان ئاوابوو، ئەو دەسەڵاتەی تا دوێنێ حوکمی لایەکی سەرزەمینی دەکرد، ئەمڕۆ گلۆڵەی کەوتە لێژیو کۆتایی بە دەسەڵاتەکەی هات، ئەو کەسەی دوێنێ خەلیفە بوو، ئەمڕۆ لە ترسی گیانی خۆی، دەبێت سەدان کیلۆمەتر ڕابکات، دەبێت شار بە شارو گوند بە گوند ڕابکاتو خۆی بشارێتەوە.. لێرەوە سەرەتای سەرهەڵدانی دەوڵەتی عەبباسی دەستی پێکرد، ئاڵای ڕەشی عەباسییەکان، لەسەر بەرزاییەکانی خیلافەت دەشەکایەوە، خەڵکی لە شاری کوفە بەیعەتیان دا بە (ئەبو عەبدوڵڵای سەففاح)، کە یەکەم خەلیفەی دەوڵەتی عەباسی بوو، لەشکری نارد بۆ گرتنی کۆتا خەلیفەی ئومەوی.

لە نێوان ئەو دوو تاقمەدا، جەنگێکی گەورە ڕووی دا، بەناونیشانی جەنگی (زێی هەرەگەورە)، لە ساڵی ١٣٢ کۆچی.

لەو جەنگەدا خەلیفەی ئومەوی تێك شکاو زۆرینەی سوپاکەی کوژران، ئەوەشی کەمایەوە ڕایان کرد، لەم شار بۆ ئەو شار، سوپای عەباسییەکانیش دوایان کەوتن؛ بۆئەوەی بە تەواوی ئەو سوپایە لەناو بەرنو جارێکی دیکە ئەگەری سەرهەڵدانەوەیان نەبێت، سوپا تێشککاوە هەڵهاتووەکەی ئومەوی، گەیشتنە میسرو لە گوندی ئەبوصیر چوونە نێو کەنیسەیەکەوەو خۆیان حەشاردا، لەشکری عەباسییەکان لەوێش کۆڵیان لێنەدانو جێ پێیان هەڵگرتنو لە شەڕێکدا کە نزیکەی ١٠ ڕۆژی خایاند، دواجار بە کۆتاییهاتنی دەوڵەتی ئومەویی کۆتایی پێهاتو خیلافەت گوێزرایەوە بۆ عەباسییەکان!

عەباسییەکان بە کوشتنی خەلیفەی ئومەوییەکانەوە نەوەستان، بەڵکو هەموو ئەو کەسانەیان کوشت، کە سەر بەو دەسەڵاتە بوونو سەربازو دڵسۆزی ئومەوییەکان بوون، لەو شەڕەدا زۆرێك لە ئومەوییەکانو لایەنگرانیان کوژران، زۆریشیان خۆیان بەدەستەوە داو داوای ئەمانیان کرد، ئەوانیش ئەمانیان پێدانو لەگەڵ خۆیاندا بردیانن بۆ سەربازگەکانیان، بەڵام عەباسییەکان خیانەتیان لە ئەمانەتەکەیان کردو سولەیمانی کوڕی عەلی، واتە: مامی سەفاح، هەموو ئەوانەی کوشت کە خۆیان بەدەستەوە دابوو، لاشەکەی فڕێدانە سەر شەقامەکان؛ تا سەگ تەرمەکانیان بخوات!

لەبەردەم ئەم قەسابخانە گەورە بێڕەحمانەدا، هیچ کەس لە بەنی ئومەییە ڕزگاری نەبوو، هەموو کوژران، جگە لە ژمارەیەکی کەم نەبێت، کە توانیان ڕابکەنو خۆیان بشارنەوە، عەباسییەکان لە هەر شوێنێك بیانبیستایە ئومەوییەکان هەن، دەچوونە سەریانو کوشتوبڕیان دەکردن.

پاكو بێگەردی بۆ خودا، بەرزکەرەوەو نزمکەرەوە تەنها خۆیەتی، ئەو کەسانەی دوێنێ، کاربەدەستو دەسەڵاتدارو خاوەن پلەوپایەو ڕێزدار بوون لای خەڵکی، ئەوانەی دوێنێ کۆشکو تەلارەکانیان دەڕازاندەوە، سەروەتو سامانی بێشوماریان لەبەردەستدا بوو، ئەوانەی تا دوێنێ فەرمانی کوشتنی هەر کەسیان بکردایە، دەکوژرا.. هەر کەسیان ئازاد بکرادایە، ئازاد دەبوو، ئەوانەی دوێنێ سوپایەکی بێشومار لەژێر ڕکێفو ئیعازو فەرمانی ئەواندا بوو، ئەوانەی دوێنێ کەس نەیدەتوانی تەنانەت قسەیەکیان ڕووبەڕوو بکات، ئەوانەی دوێنێ سەدان پاسەوان لەبەر دەرگاکانیان چاوێکیان کردبوو بە دە چاوو پاسەوانیان دەکردن،... هتد، ئەمڕۆ گۆڕیشیان پێ ڕەوا نابینرێت، کۆشكو تەلاریان دەبێت بە مولکوماڵی نەیارەکانیان، هیچ کلۆجێك لەم زەمینە بەرینەدا نادۆزنەوە خۆیانی تێدا حەشار بدەن، سەروەتو سامانیان دەکەوێتە دەست نەیارو دوژمنانیانو بێحاڵوماڵ، بێپاسەوان، شوێنێك شك نابەن، تێیدا بحەوێنەوە، ئەوانەی تا دوێنێ هەزاران کەس ئامادەبوون خۆشترین خواردن درووست بکەنو پێشکەشیان بکەن، ئەمڕۆ کەس نییە قومەئاوێکیان پێ بدات، خانەولانەیەکیان پێ بدات، کەس نییە پەنایان بدات، لە هەر شوێنێك ببینرێن، هەر ئەوانەی دوێنێ ماستاویان بۆ دەکردن، ئەمڕۆ هەواڵیان لێ دەدەن! کەواتە: ژیر ئەو کەسەیە بە دەسەڵاتو پلەو پایە فریو ناخوات، هەمیشە ئاکاری جوانو ڕەفتاری ناوازەو گوفتاری شیرینە، ستەم لە کەس ناکات، ماڵو سامانی میللەتەکەی بە هەدەر نادات، کارێك ناکات میللەتەکەی بکاتە دوژمنی خۆی، کارێك ناکات هەمووان دەستەو نەزەر نزای لێ بکەنو چاوەڕوانی کەوتنو زەلیلبوونو دەربەدەری بکەن! بەو هیوایەی هەمووان پەند لە مێژووی دەسەڵاتدارانو پاشایانی پێش خۆمان ببینین!

لێرەوە با بگەڕێینەوە بۆ لای عەبدوڕەحمانی کوڕی موعاویەو براکەی کە لەو ژمارە کەمەبوون، کە توانییان ڕابکەنو خۆیان لە دەست عەباسییەکان ڕزگار بکەن، ئەوان خۆیان لە نزیك گوندێکی سەر ڕووباری فوڕات دوور لە چاوی سوپای عەباسی شاردەوە، عەبدوڕەحمان ئەو کات تەمەنی نۆزدا ساڵان بوو، داوای لە ئاسیاوێکی کرد، کە ولاخێکی بۆ بکرێت، لەو سەروبەندەدا، سیخوڕی عەباسییەکان پێیان زانینو هەواڵیان لێدان، دواجار عەباسییەکان شوێنی عەبدوڕەحمانو براکەیان دۆزییەوەو گەیشتنە سەریان، کاتێك عەبدوڕەحمان سەربازەکانیان بەدی کرد، جگە لە پەڕینەوە بەناو ئاوی فوڕاتدا، هیچ ڕێگە چارەیەکی دیکە نەبوو، لەبەرئەوە لەگەڵ براکەیدا، خۆیان فڕێ دایە ناو ڕووباری فوڕاتەوەو بەخێراییو بەمەلە دەستیان بە

پەرینەوە کـــرد، عەبدورەحمـــان توانی بپەڕێتەوە ئەوبـــەری ڕووبار، بـــەڵام براکەی نەیتوانی بەمەلە بپەڕێتـــەوە، ناچار گەڕایەوە کەناری ڕووبارەکـــە، ســـەربازەکانی ســـوپای عەباســـی دەســـتگیریان کردو لە کاتێکدا عەبدورەحمان لە دوورەوە بەوپەڕی ئازارەوە ســـەیری دیمەنی دەســـتگیرکردنی برا تاقانەکەی دەکرد، بینی بێڕەحمانە لە گەردنیان دا، ئەو دیمەنە زۆر کاریگەریی درووســـت کرد لەســـەر عەبدورەحمان، بەڵام هیچ دەسەڵاتیشـــی نەبـــوو، عەبدورەحمان بۆ دوور کەوتنەوە لە دەســـەڵاتی بێڕەحمانەی عەباســـییەکان، بەرەو مەغریـــب بەڕێکەوت، بـــەردەوام بوو لە ڕۆیشـــتنو دووركەوتنەوە لە خاكو ژێر دەســـەڵاتی عەباسییەکان، تا ئەو کاتەی گەیشتە ئەفریقا..

چیرۆکـــی ڕاکردنی عەبدورەحمـــان دووردرێژە، لەبەرئـــەوە ئێمە لێرەدا تەنها باس لە ڕۆیشـــتنی عەبدورەحمان دەکەین لە شـــامەوە بۆ ئەندەلوس، کە چیرۆكێکی نایابەو شایەنی ئەوەیە بخوێنرێتەوەو پەندی لێوەربگیرێت...

**عەبدورەحمان لە ئەفریقا:**

هیچ کام لە ئومەوییەکان، لە ئەفریقا نەبوون، هەر لە خەیاڵیشیاندا نەبـــوو بگەنە ئەفریقـــا، هیچ هیوایەکیـــان نەبوو کـــە ئەفریقا ببێت بـــە پەناگەیەك بۆیان، لەبەرئـــەوەی (ئیبن الحبیـــب الفهری) لەلایەن عەباســـییەکانەوە کرابـــووە فەرمانـــڕەوای ئەفریقا، فەهری کەســـێکی دڵسۆزو بەوەفابوو بۆ عەباسییەکان.

بەڵام ئـــەوە نەبووە ڕێگر بۆ مانـــەوەی عەبدورەحمان، ئەو توانی ماوەی پێنج ساڵ لە ئەفریقا بمێنێتەوە، لەو ماوەیەشدا خۆی شاردەوەو نەیهێشـــت عەبدورەحمانی کوڕی حەبیب بزانێت کە لەژێر دەســـەڵاتی ئەودایە!. عەبدورەحمان لەو ماوەیەدا زۆر لە ناڕەحەتیو دەردەسەریو هەژاریـــدا دەژیـــا، بەڵام دوای ئەو چەند ســـاڵە، کەمێك خۆشـــی ڕووی تێکـــرد، ئەویـــش بەهۆی ئەوەی خوشـــکەکەی کەســـێکی نـــارد بۆ لای عەبدورەحمانو گەوهەرو مرواریییەکانی خۆی بۆ ناردبوو، کەســـەکەش واتە: نێردراوەکە وەکو پارێزەرێك لەگەڵیدا بمێنێتەوە!! عەبدورەحمان سوودی لەو گەوهەرو مرواریانە بینیو توانی خۆی پێ بژێنێتو خۆی پـــێ بگرێت لە ناو بەربەرییەکاندا، کـــە خزمەکانی دایکی بوون، لەناو هۆزەکانی ئەواندا مایەوەو لەلای هۆزی ڕۆستەم خۆی حەشاردا!

**عەبدورەحمان چاوی لەسەر ئەندەلوس بوو:**

بارودۆخی ئەندەلوس خراپ بوو، ئەندەلوس دوچاری وشکەســـاڵیو دابەشبوون هات، لە نێوان هۆزەکانی مەزەریو یەمەنیدا.. عەبدورەحمان ئەو هەلەی قۆســـتەوەو پلانی دانا بۆ دەست بەسەراگرتنی ئەندەلوس، بۆ ئەم مەبەســـتە پەیامێکی نووسی، بە مەولای بەردەستیدا ناردی بۆ هەمـــوو ئەو ئومەویانەی کە لە ئەندەلوســـدا دەژیـــان، پێی ڕاگەیاندن لـــە هەر شـــوێنێك هـــەنو خۆیـــان حەشـــارداوە، لـــە پیاوماقـــووڵانو گەورەپیـــاوانو کەســـانی بەهێـــزو ئازا، بێـــن بـــۆ لای عەبدورەحمانو گوێڕایەڵـــی فەرمانەکانی بکەن؛ بۆئەوەی دەوڵەتی ئومەوی درووســـت بکەنـــەوە، بەڵام لـــە ئەندەلـــوس، ئەوانیش گوێڕایەڵیـــی فەرمانەکەی ئەویـــان کردو بـــە دەمییەوە چوون، ســـاڵی ١٣٨ کۆچـــی بەرامبەر ٧٥٥ زاینی، کاتێك ئومەییەکان گەیشـــتنە لای، عەبدورەحمان هێزێکی باشی لێ درووســـتکردن، ئیدی هەوڵـــی وەرگرتنەوەی دەســـەڵاتی دا، بۆ ئەم مەبەســـتە پەلاماری کۆشـــکی فەرمانڕەوای ئەندەلوســـیان داو شەڕیان لەگەڵ فەرمانڕەوای ئەندەلوس (یوسفی کوڕی عەبدورەحمانی فیهری) دا کردو توانیان لە ناوچەی مەصارە لە نزیك شاری قورتوبە، سەرکەوتن بەدەســـت بهێنن، ســـاڵی ١٣٨کۆچی عەبدورەحمان چووە ناو قورتوبەوە، دەوڵەتی ئومەوی ڕاگەیاندو بووە پاشای ئەندەلوس!

نەیارانی زۆر هەوڵیان دا؛ تا پێشی پێ بگرنو ڕێگە نەدەن دەسەڵات بگرێتە دەست، بەڵام هیچ کام لە هەوڵو کۆششی نەیارەکانی، نەیانتوانی سەرکەوتوو بن؛ بۆئەوەی دەسەڵاتی لێ بسەننەوە، عەبدورەحمان بووە خاوەنی سوپایەکی بەهێزو ئازا.. هەرچەندە ئەبوجەعفەری مەنصوورو فەهـــریو هاوپەیمانە فەرەنســـییەکەیو هاوڕێکـــەی صەمیل هەوڵیان دا، بـــۆ ڕووخانی دەوڵەتە نوێیەکـــەی عەبدورەحمان، بەڵام نەیانتوانی دەســـت بگرن بە سەر دەوڵەتەکەی عەبدورەحمانی داخیلدا، بەڵکو لەو شەڕەدا ســـوپاکەی فەهری شکاو خۆشی واتە: فەهری کوژرا، (صەمیل) یش بەدیل گیراو دواتر لە زینداندا گیانی لە دەستدا.

**هەوڵەکانی ئەبوجەعفەری مەنصوور بۆ گێڕانەوەی ئەندەلوس:**

ئەبوجەعفـــەری مەنصـــوور ڕقو کینـــی دانەمرکایـــەوە لەســـەر عەبدورەحمانـــی داخیل، بەردەوام لە هەوڵدا بـــوو؛ بۆئەوەی بتوانێت ئەندەلـــوس لە ژێر چنگی عەبدورەحمان دەربهێنێتو بە دیلی بگرێت، بۆ ئەم مەبەستە سەرکردەیەکی لە ئەفریقاوە نارد بۆ ئەندەلوس، بەڵام عەبدورەحمان توانی بەسەریدا سەربکەوێتو سەرکردەکەش بکوژێت!

ئەبوجەعفـــەر لەســـەرجەم هەوڵەکانی بۆ گێڕانـــەوەی ئەندەلوس بۆ ژێر دەســـەڵاتی عەباســـییەکان شکســـتی هێنا، دواجار ئەبوجەعفەر ڕێگەیەکـــی دیکـــەی بـــەکار هێنا. بـــۆ دڵدانـــەوەو کەمەندکێشـــکردنی عەبدورەحمانی داخیلو چەندین نوێنەری ئاشتی نارد بۆلای!

پەیامی خۆی بە وەفدەکەدا بریتی بوو لەوەی کە سەرســـامی خۆی نیشاندا بوو بە تواناو لێهاتوویيو بەهێزیو ورەبەرزی، کە تۆ کەسێکی ئـــاوارەو دەربـــەردەر بوویـــت، توانیوتە لـــەو وڵاتە دوورە دەســـتە ئەو دەسەڵاتە پەیدا بکەیتو ببیت بە خاوەنی ئەو وڵاتە!

**هەڵۆکەی قوڕەیش:**

هەندێك لە مێژوونووســـان باس لەوە دەکەن کە ئەبوجەعفەر بە هاوڕێکانی دەگوت: پێم بڵێن هەڵۆکەی قوڕەیش کێیە؟

هاوەڵەکانـــی گوتیان: فەرمانـــڕەوای باوەڕداران، ئەو کەســـەیە کە پادشـــا لێـــی ڕازییە، دوژمن لەنـــاو دەبات، ئۆقرەیی بەرقـــەرار دەکات، دوژمن لەناو دەبات. گوتی: مەبەستان کێیە؟ گوتیان: موعاویە.

خەلیفە گوتی: نەخێر ئەو نییە.

وتیان: عەبدولمەلیکی کوڕی مەروانە.. گوتی: نەخێر ئەویش نییە!

گوتیان: کەواتە: کێیە ئەی فەرمانڕەوای باوەڕداران؟

ئەبوجەعفەری مەنصوور گوتـــی: عەبدورەحمانی کوڕی موعاویە، هەڵۆکـــەی قوڕەیشـــە، ئەو کەســـەی بـــە مەلـــە دەریای بـــڕی، بە پێ ســـەدان میـــل چۆڵەوانـــی بڕی، بـــە تەنها چـــووە وڵاتێکـــی بێگانەوە، وڵاتی ئاوەدانکردەوە، ســـوپای بەهێزی درووســـتکرد، دیوانو بەرنامەی کارگێڕی بۆ وڵاتەکەی نووسییەوە.. بووە پادشا دوای دابڕانو ڕووخانی خیلافەتەکـــەی، بەهۆی بەهێـــزیو چاکیو جوانـــی بیرکردنەوەکانیو بەهێزی سەرکەوتنەکانییەوە.

**سیفاتەکانی عەبدورەحمانی داخیل:**

عەبدورەحمـــان پیاوێکـــی دووربین بوو، گورجوگـــۆڵو ئازا بوو لە ڕاپەڕینـــدا، تونـــدو بەهێزو بەتاو بوو لـــە وەڵامدانـــەوەی نەیارانیدا، زۆر پـــرسو ڕاوێـــژی دەکرد، ئازاو بەهێزو پاڵـــەوان بوو، زۆر حەزەری دەکرد، بەخشندەو دەستکراوە بوو، زمانپاراوو شاعیر بوو، زانا بوو، بە دووربینیی خۆی بۆ تاریکاییەکانی دەڕوانی، وەســـفی لاوازی بە بەهێز دەکرد، ڕەصافەی لە قورتوبە درووست کرد هاوشێوەی باپیری، هشام کە ڕەصافەی لە شام درووست کرد، قورتوبەی بە چەندین کۆشكو تەلاری بەرزو باخچەو ســـەوزایی ڕازاندەوە، هەڵسا بە درووستکردنی مزگەوتی گـــەورەی قورتوبە، کە دوای خۆی کوڕەکـــەی تەواوی کرد، کە قورتوبە شانازی دەکات بەو مزگەوتەوە بەسەر هەموو پایتەختەکانی جیهاندا!

**کۆچی دوایی عەبدورەحمانی داخیل:**

ســـاڵی ١٧٢ی کۆچی، عەبدورەحمانی داخیل لە قورتوبە کۆچی دوایی کردو بۆ هەمیشـــە ماڵاوایـــی لە ژیان کرد، دوای ئەوەی توانی ٣٣ ســـاڵو چـــوار مانگ، حوکمی وڵاتی ئەندەلوس بکات، کـــە هەوڵی دەدا، لە ڕووی پێشـــکەوتنو شارســـتانییەتەوە، شـــان لە شـــانی دەوڵەتی عەباسی بدات. ئەندەلوس بوو بە چرایەکی ڕووناكو تاریکایی ئەورووپای ڕووناك کردەوە!

# خۆری سەوزو شین..!

**سەرچاوەکانی پیسبوونی ژینگە دوو جۆرن:** سرووشتیو دەستکردی مرۆڤ، دووکەڵی گڕکانەکان کە لەئەنجامی تەقینەوەی گڕکانەکانەوە دروست دەبێت، لەگەڵ خۆڵبارین کە لەئەنجامی بای بەهێزەوە، کە هەڵگری خۆڵە درووست دەبێت، دوو پیسکەری سرووشتین، زۆرترین کاریگەرییان هەیە لەسەر ژینگەو چینەکانی کەش، لێرەدا باسی گڕکانەکان دەکەین، گڕکانەکان لە کاتی چالاکبوونو تەقینەوەدا، تەپوتۆزو خۆڵەمێشو دووکەڵ دەکەنە ژینگەوە، هێزی تەقینەوەکەو بڕی دووکەڵو خۆڵەمێشەکەی لەسەر کەشو هەوای زەوی کاریگەریی خۆی هەیە، نموونەی گڕکانێك باس دەکەین، گڕکانی (کراکاتو، یان کراکاتوا)، دواین چالاکی گڕکانەکە ساڵی ٢٠١٤بوو.

نزیکەی زیاتر لە ١٣٠ ساڵ لەمەوبەر، لە ٢٧-٨-١٨٨٣، تەقینەوەیەکی گڕکانی ڕووی دا لە دوورگەی گڕکانی (کراکاتو) لە وڵاتی ئەندەنووسیا، لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، کە دەکەوێتە تەنگەبەری سوندا، لە نێوان هەردوو دوورگەی (جاوا)و (سۆمەترە)، مێژوویەکی پڕ لە تەقینەوەی گڕکانی هەیە، بەڵام ئەوەی لەو ڕۆژەدا ڕووی دا، بە یەکێك لە گەورەترین ڕووداوەکان دادەنرێت، لە مێژووی تەقینەوە گڕکانییەکاندا، کە تائێستا تۆمار کرابێت لە جیهاندا، لەم جۆرە تەقینەوانە، زۆر بەکەمی ڕوو دەدەن، سەدان ساڵ یەك جار، دەنگی تەقینەوەکە لەدووری (٤٠٠) کیلۆمەترەوە بیسترا، دەنگەکەی وەك دەنگی تۆپ وابوو، لە شەودا نزیکەی (٣-٤) سەعات دەنگەکەی بەردەوام بوو، تەپوتۆزو خۆڵەمێشی گڕکانەکە، تا (٨٠) کیلۆمەتر بەرزبووەوە بۆ چینە بەرزەکانی کەش، لە ناوچەکانی دەوروبەری گڕکانەکە، خۆر بەتەواوی دیار نەما، بەجۆرێك لەناو شەودا بوون بۆماوەی دوو ڕۆژو نیو.

لەماوەی ١٣ ڕۆژی دوای تەقینەوەکە، تەپوتۆزو خۆڵەمێشەکەی، تەواوی زەوی ناوچەی باکووری هێڵی کەمەرەی زەوی داپۆشی، تەپوتۆزە سووکەکەی، کە لە چینە بەرزەکانی کەشدا مابووەوە، تا دوای ٣ مانگ لە تەقینەوەکە، دیمەنێکی جوانی بە ئاسمان بەخشی!! بوو بەهۆی دەرکەوتنی دیمەنی سەرنجڕاکێشی سوور لە کاتی خۆرئاوابووندا، تا ئەو کاتە نەبینرابوو، هەروەها دیاردەی ناباو، وەك دەرکەوتنی خۆر بەڕەنگی سەوز، یان شین، ئەم دیمەنە سەرنجڕاکێشانە لە کاتی خۆرئاوابووندا بەدرێژایی زستانی ساڵی ١٨٨٤ بەردەوام بوو، لە هەریەکە لە ئەورووپاو ئەمریکادا، بەڵام دیمەنی خۆرئاوابوونی ناباو، بۆ ماوەی ٣ ساڵ درێژەی کێشا.

ئەم گڕکانە، لە ڕۆژانی ٢٦/ -٢٧/٨/١٨٨٣ دا، چوار جار تەقییەوە، بەڵام بەهێزترینیان جاری سێیەم بوو، بڕی ئەو ماددانەی کە هەڵی دەدان بۆسەرەوە، زانایان لەسەر ئەو ڕایەن کە زیاتر بووە لە (٢١) کیلۆمەتر سێجا، بەشی هەرە زۆری دوورگە گڕکانییەکەی لەڕەگەوە دەرکێشا، نزیکەی ٣/١ مایەوە لەسەر ڕووی ئاو، دواتر بوو بەگڕکانێکی چالاكو ناویان لێنا (کراکاتو) واتە: (منداڵی بچووك)!، ئەو وزەیەی لە هەرچوار تەقینەوەکە دەرچوو بەرامبەر بوو بە (٢٠٠) میگا تەن لە مادەی (TNT)، بەشی زۆری ئەم وزەیە کە بڕەکەی ١٥٠ مێگا تەن (TNT) بووە لە تەقینەوەی سێیەمدا بووە، بۆ بەراوردکردن بۆمبی ئەتۆمی هێرۆشیما کە وزەکەی (٢٠) کیلۆ تەن بوو، واتە: بیست هەزار تەن (TNT) بووە، مانای وایە تەقینەوەکە بەرامبەر بووە بە(دە هەزار) بۆمبی ئەتۆمی لە جۆری هێرۆشیما، تەقینەوەکە بوو بەهۆی زنجیرەیەك شەپۆلی بەهێزو گەورە لە دەریادا، بەرزیەکەی دەگەیشتە (٤٠) مەتر، واتە: بەرزتر لە ١٣ ڤات، ئەم تەقینەوەی (کراکاتو) بوو بەهۆی لەناوچوونی (٣٦٠٠٠) کەس، لە کەناراونشینەکانی (جاوا)و (سۆمەترە)، ئەم شەپۆلانە لە کەناراوە زۆر دوورەکانیش تۆمارکران، وەك زەریای هندیو هێمن، کەناراوەکانی هەردوو ئەمریکاو کەناڵی ئینگلیزی.

بڕی ئەو مادەیەی کە چووە هەواوە، (٢١کم٣) بوو، واتە: (٢١ملیار مەتر سێجا)، لە تەپوتۆزو خۆڵەمێش، نزیکەی چوار کیلۆمەتر سێجایان بۆ بەرزی (٢٧کم) بەرزبووەوە، تەپوتۆزە گڕکانییەکە، بەهۆی شەپۆلەکانی باوە، چەندجارێك بەدەوری زەویدا گوێزرایەوە، بەتەنها دیمەنی سەرنجڕاکێشی درووست نەکرد، بەڵکو بوو بە فلتەرێك بۆ پاڵاوتنی تیشکی خۆر، تینی تیشکەکەی کەم کردەوە، بەجۆرێك ساڵی دواتر، تێکڕای گەرمی جیهانی بەڕێژەی (١،٢) پلەی سەدی دابەزینی بەخۆیەوە بینی، لەهەندێك ناوچەی دیاریکراو دوو هێندەی ئەم ژمارەیە بوو، کەشوهەوا بەناجێگیری مایەوە بۆ چەند ساڵێك، ئاڵوگۆڕ لە هەموو سەرزەویدا ڕووی دا، پلەکانی گەرما نەگەڕایەوە سەر باری جارانی خۆی، تا پێنج ساڵ دواتر، واتە: ساڵی ١٨٨٨ ز.

سەرچاوە: کتێبی حل مشكلة الطاقة – فؤاد قاسم الأمير





ئالانی



# میخائیل تیمۆفیچ کلاشینکۆف

## ۱۹۱۹ — ۲۰۱۳

### میخائیل کلاشینکۆف کێیە؟

میخائیل دامەزرێنەرو داهێنەری چەکی کلاشینکۆفە، ئەو چەکەی کە پێویست بە ناساندن ناکات؛ چونکە هەمووان بەو چەکە ئاشنان، کێ هەیە ناوی ئەو چەکەی نەبیستبێت؟ زیاتر لە پەنجا ساڵە ئەو چەکە بەرگری لە کواڵیتیو باشیو پێشەنگی خۆی کردووە، کلاشینکۆف ئەو چەکەی لەلایەن زۆرێك لە شۆڕشگێڕانو ئازادیخوازانو زۆرجار داگیرکەرو دوژمنانی مرۆڤایەتیشەوە بەکار دەهێنرێت! تەنانەت منداڵانیش ئەو چەکە دەناسنو پێی ئاشنان!

گەر بپرسین چی وای کردووە، کە ئەم چەکە، تا ئەو ئاستە بەناوبانگو بەکارهاتوو بێت، لە نێو زۆرێك لە ڕیزی سوپای وڵاتاندا بەکار دەهێنرێت؟ چی وای کردووە، کە ئەم چەکە بەزیندوێتی بمێنێتەوە لەو ساتەی دروووست کراوە، تا ئەم ساتەوەختە؟ تا ئێستا نزیکەی ۱۰۰ ملیۆن دانەی لێ دروووست کراوە؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە، با بگەڕێینەوە بۆ ژیاننامەی داهێنەری ئەم چەکە، کلاشینکۆف.. پیاوێکی بەناوبانگی ون!!

میخائیل لە ۱۹۱۹/۱۱/۱۰ لە خێزانێکی ڕووسیایی هەژارو جووتیار هاتووەتە دونیاوە، لە ناوچەیەکی دوورەدەست، کە پێی دەگوترا: (الناى)، دایکی میخائیل ۱۸ منداڵی بووە، بەڵام تەنها ۸ منداڵیان ماونەتەوە، ئەوانی دی هەر بە منداڵی کۆچیی دواییان کردووە، میخائیل یەکێك بووە لەو هەشت منداڵە، سەرجەم براکانیو باوکی میخائیل بە کاری کشتوکاڵییەوە سەرقاڵ بوون، بەڵام میخائیل حەزی بە کاری کشتوکاڵی نەدەکرد، بەڵکو حەزی لە بواری میکانی دەکردو هەستی دەکرد لەو ڕێگەیەوە دەتوانێت حەزو ئارەزووەکانی خۆی تێربکات.. بەڵام لەبەرئەوەی باوکی کلاشینکۆف جووتیار بوو، بە کاری کشتوکاڵییەوە زۆر ماندوو دەبوو، کاتێکی زۆری لەو پێناوەدا بەسەر دەبرد، کلاشینکۆف هەوڵی دا بۆ هاوکاری باوکی، ئامێرێکی کشتوکاڵی دروووست بکات، ئیدی بیرۆکەی دروووستکردنی ئامێرێکی میکانیکی کشتوکاڵی بیرو هزری سەرقاڵ کرد، چەند جارێك هەوڵی ئامێرێکی کشتوکاڵی دا؛ بۆئەوەی کەمێك لە ماندووبوونو ئازارەکانی باوکی کەم بکاتەوە، پاشان هەوڵی دروووستکردنی پایسکیلی دا، لەو کاتەدا هیچ پایسکیلێك لە وڵاتەکەیدا بوونی نەبوو، پاشان هەوڵی

دروستکردنی بزوێنەرێکی دا، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، بەهۆی نەبوونی ئامێرو کەلوپەلی پێویستەوە.

خێزانی کلاشینکۆف، لەلایەن حکومەتەوە دوچاری دەردەسەریو نارەحەتی زۆر بوونەوە، بە بیانووی ئەوەی ئەم خێزانە نەیاری حکومەتی سۆڤیەتن، خێزانەکەی کلاشینکۆف راگوێزران بۆ وڵاتی سیبیریا، پاش ماوەیەك ژیان لە سیبیریا میخائیل ژیانی دوور لە زێدی خۆی پێ قبووڵ نەکرا، لەبەرئەوە بریاری دا بگەڕێتەوە گوندەکەی خۆیان، بۆ ئەم مەبەستەش بەپێ کەوتە ڕێ بەرەو گوندەکەی خۆیان، کە زیاتر لە ١٠٠٠ کیلۆمەتری ڕێگە بڕی، تا دواجار لە کۆتاییدا گەیشتەوە زێدی خۆی، لە ئەنجامی ئەو بارودۆخە سەختەی دوچاری کلاشینکۆفو خێزانەکەی بوویەوە، ناچار بوو لە قۆناغی ناوەندیدا واز لە خوێندن بهێنێتو هەوڵی پەیداکردنی بژێویی ژیان بدات، بەتایبەت لەو بارودۆخەدا، کە کلاشینکۆف دوور لە خێزانەکەی ژیانی دەگوزەراند، سەرەتای کارکردنی میخائیل لە سکەی شەمەنەفەرەوە دەستی پێکرد، لە کارەکەیدا توانی شارەزاییەکی باش لە بواری میکانیکدا پەیدا بکات، پاشان لە ساڵی ١٩٣٨ میخائیل چووە پاڵ سوپای وڵاتەکەی بۆ کاروباری تەقەمەنی لە بواری دەبابەدا، ئیدی لە گۆڕەپانی دروستکردنی چەكو تەقەمەنیدا، لێهاتووییو توانا شاراوەکانی میخائیل وەدەرکەوتن، ئەو کات تەمەنی میخائیل تەنها بیست ساڵ بوو.

## جەنگی جیهانی دووەم:

لەگەڵ هەڵگیرساندنی جەنگی جیهانی دووەمدا، میخائیل بەشداری کرد لە شەڕی (بریانسك) ساڵی ١٩٤١، دژی ئەڵمان، لەو شەڕەدا میخائیل بریندار بوو، ئیدی میخائیل گوازرایەوە بۆ نەخۆشخانەیەکی مەیدانی، بۆ وەرگرتنی چارەسەر، پاشان گواستیانەوە بۆ نەخۆشخانەی فەرمیی یەکێك لە شارە نزیکەکانی نزیك جەنگەکەوە، میخائیل دەڵێت: سەرەڕای ئازارو نارەحەتیی برینەکەم، گوێم لە زۆرێك سەربازە بریندارەکان بوو، کە هاتبوونە هەمان نەخۆشخانە، دەیانگوت: ئەڵمانییەکان چەکێکی تایبەتیی پێشکەوتوویان پێیە، کە زۆر وردە لە پێکانی بەرامبەردا، زۆربەی سەربازە ڕووسییەکان بەهۆی ئەو چەکەوە بریندار بوون، میخائیل دەڵێت: ئیدی بیری داهێنانی ئامێری کشتوکاڵیم لە زیهنمدا گۆڕی بۆ بیرۆکەی دروستکردنی چەکێکی تایبەتی، کە لەوەی ئەڵمانییەکان پێشکەوتووترو چاکتر بێت لە مەیدانی جەنگدا.

میخائیل دەڵێت دوای ئەوە: بیرۆکەکانم یەکخستو دروستکردنی چەکێکی کەسی پێشکەوتووم کرد بە کاری لەپێشینەم، دوای تەواوکردنی خزمەتی سەربازیم، گەڕامەوە بۆ سکەی شەمەنەفەرو بە هاوکاری هاوڕێکانم دزەم دەکردە نێو وەرشەی شەمەنەفەرەکەو هەوڵی کارکردنم دەدا بۆ گەیشتن بە بیرۆکەکەم، بەڵام لەسەر ئەو کارەم، واتە: چوونە نێو وەرشەی سکەی شەمەنەفەرەکەوە سێ جار بەند کرام؛ چونکە چوونە ناوەوە قەدەغەبوو، تەنها کەسانی پسپۆڕ، بۆیان هەبوو بڕۆنە ژوورەوە.

دواتر لە ساڵی ١٩٤٩ وەزارەتی بەرگریی سۆڤیەت، پێشنیاری کرد بۆ ئەو داهێنەرانەی ناوی خۆیان تۆمار کردبوو، کە وەزارەت فیشەکێکی بە ئەندازەی **7,62** ملم دروست کردووە، پێویستی بە چەکێك هەیە؛ بۆئەوەی ئەو فیشەکە بەکاربهێنن، لەو کاتەدا میخائیل بیرۆکەکەی پێشکەش بە وەزارەتی بەرگری کرد، شارەزایانو پسپۆڕان زۆر سەرسام بوون بە بیرۆکەکەی میخائیل، لە نێو خۆیاندا دەیان پرسی، چۆن عەریفێکی ئاسایی توانیویەتی ئەو داهێنانە پێشکەوتووە پێشکەش بکات؟!

دوای ئەوەی لەلایەن شارەزاو پسپۆڕانەوە تاقیکرایەوەو بەکارهێنرا لەلایەن سوپای سوورەوە، هەروەها لەلایەن سوپای پەیمانی وارسۆی پێشوو، دەرکەوت کە ئەو چەکەی میخائیل پێشکەشی کردووەو توانیویەتی دروستی بکات، چەکێکی کاریگەرو کوالێتییەکی بەرزو وردەکاری هەیەو دەتونرایێت لەبەرەکانی جەنگدا پشتی پێ ببەسترێت!

ئیدی لەو کاتەوە، تا ئەمڕۆ چەکی کلاشینکۆف جێگەی سەرسامی زۆرێك لە سوپاو جەنگاوەرو شارەزایانو سەربازەکانە لە سەرتاسەری جیهاندا. ـهەر خوداش دەزانێت لە ئایندەداو تاکەی- ئەم چەکە بەکار دەهێنرێتو پێشەنگی خۆی لە دەست نادات!

## چەند ڕاستییەك لە بارەی میخائیل کلاشینکۆفەوە:

* خەڵاتی ستالینی بەدەستهێنا، کە بەرزترین خەڵاتە کە لە یەکێتی سۆڤیەت واتە: لە ڕووسیا دەبەخشرێت!

* ساڵی ١٩٥٨ حکومەتی سۆڤیەت یەکەم مەدالیای پاڵەوانی کاری سۆشیالی (ئەستێرەی ئاڵتوونی) پێشەکەش کرد.

* خەڵاتی لینینی وەرگرتووە بەهۆی داهێنانی فیشەکی ئەندازە **45،5** ملم.

* لە ساڵی ١٩٥٣ دوە بۆ ماوەی شەش ساڵی بەردەوام پۆستی ئەندامی ئەنجومەنی سۆڤییەتی هەبووە.

* نازناوی (ئەندازیارو دکتۆر)ی، پێبەخشراوە.

زیاتر لە سوپای ٥٥ دەوڵەت چەکی کلاشینکۆف بەکار دەهێنن..

## ماڵاوایی کلاشینکۆف لە ژیان:

کلاشینکۆف دوچاری نەخۆشی بوو، دوای ئەوەی خرایە ژێر چاودێریی وردی پزیشکییەوە، لە شاری ئیجیفسکی ڕووسی، لە ٢٣/دیسەمبەری ساڵی ٢٠١٣ کلاشینکۆف لە تەمەنی ٩٤ ساڵیدا کۆچیی دوایی کردو بۆ هەمیشە ماڵاوایی لە ژیان کرد، سەرۆکی ڕووسیا ڤلادیمیر پۆتین، پرسەنامەی پێشکەش کرد، سەرۆکوەزیران (دیمیتری میدڤیدیف) بە بۆنەی کۆچی دوایی میخائیل کلاشینکۆفەوە گوتی: وڵاتەکەمان خەسارەتێکی گەورەی کرد، کە ناتوانین پڕی بکەینەوە)، تەرمەکەی لە ناحیەی کۆمەڵگەی سەربازی فیدراڵی لە تەنیشت مۆسکۆ بەخاك سپێردرا، کە سەرۆکی وڵاتەکەی پۆتینو وەزیری بەرگری (سریگی شویگۆ) سەرۆکی دیوانی سەرۆکایەتی (سیرگای ئیڤانۆف) ئامادەی بەخاکسپاردنەکەی بوون!




# بۆ خوێندکاران

دیار پشتیوان عوسمان
مامۆستا لەقوتابخانەی ئیشک

١- هەوڵ بدە لەگەڵ هاورێو برادەری زیرەکو بەرەوشتو کەسی بەهیوای سەر کەوتوودا بیت.

٢- نووسینەوەی تەواوی وانەکان لە یەکەم ڕۆژو سەرەتاوە.

٣- دانانی تیانووس بۆ هەر وانەو بابەتێکی سەربەخۆ، بەشێوەیەکی پوختوڕێك، لەگەڵ نووسینی گشت تێبینیو سەرنجێك.

٤- شوێنو مێزی دانیشتنت لە نزیك تەختەو فێرکارو هەروەها لە تەنیشت کەسی لەبارو هاوکارو ڕێزداردا بێت.

٥- بێدەنگیو بەهەستبوونو وردبوونەوە لە کاتی دەستپێکردنی فێرکار بە بابەتو وانەکە، تاکۆتاییو پاشان نووسینەوەی بەشی داواکراوو مەبەست، نەك نووسینەوەو خەریکبوون لەمیانەی شیکردنەوەی فێرکاردا.

٦- هێمنیو ئارامیو سینەفراوانی لەهەڵسووکەوتت لەگەڵ هەموو هاورێو دەوروبەر، لێبوردنو چاوپۆشی. بابەخدانو بەهەندوەرگرتنی بەرژەوەندیو مەبەستی سەرەکیت، نەوەك شتی لاوەکیو کات بە فیرۆدان لەگەڵ کەسوتاکی بێبەرنامە، بەڵام بێ لەبیرکردنی ڕێزو خۆشەویستیو ڕێنمایی بۆ هەموو مرۆڤێك بەپێی تواناو گونجان بەتێڕوانینی خۆت.

٧- تێگەیشتن پاشان لەبەرکردن، هەوڵدانیش بۆ تێگەیشتن لە هەروانەو بابەتێك کە لە خوێندن لەدەستت چووبێت، یان تێی نەگەیشتبی، یان وەك پێویست نەبوو بێت، بەڵام هەمیشە وریابە لەرەچاوکردنی هەستو ڕێزی مامۆستاکەش هەرچۆنێك بێت.

٨- لەبەرکردنی ڕۆژانە بەبێ سستیو تەمبەڵی، نەك دواخستنو ئەرکی ئەمڕۆ خستنە سبەینێ؛ تاوەکو چەند ئەرکێك بەسەرتەوە کۆ نەبێتەوەو دواجار توانات بەسەریدا نەمێنێت، یان دوچاری ماندوبوونو زەحمەت بیت.

٩- گرتنەبەری هۆکاری چووستو چالاکی، پاکوخاوێنی، بۆنخۆشی، پشودان، خەوتن، خواردن، سەردانی دۆستو کەسی دڵسۆز، بیرکردنەوە لە هیوات بۆ خزمەتی گەورە.

١٠- بە گرنگ ڕوانینە خوێندن بۆ مانگانەو نیوەی ساڵ؛ چونکە سەرەتا هەنگاوێکە بۆ تاقیکردنەوە کۆتاییەکان.

١١- پێش وەختو دەوام، یان لە کاتی فرسەتو پشووەکاندا، سوودوەرگرتنو پێداچوونەوەی هەر وانەو بابەتێك، بەهۆی کاسێتو مەلزەمەوە، تۆمارکردنی هەر ماناو یاسایەکی گرنگو نوێ لە نێو تیانووسی تایبەتی وانەی خۆت.

١٢- هاوکاریو بیروڕا ئاڵوگۆڕکردن لەگەڵ مامۆستای وریاو لێهاتوو، یان لەگەڵ هاورێی شایستەو لێوەشاوە.

١٣- شێوەی خەتو نووسینو دەستو بردو چالاکبوون لە نووسینەوەی وانەکان، وەڵامدانەوە لە تاقیکردنەوەکان بە پرۆڤەکردنو زیاتر نووسین لە کاتی هەڵو دەرفەت، چەندجار دووبارەکردنەوەی نووسینی یاساو نموونەکان لەرەش نووسێکدا بۆ گشت بابەتەکان، ئەمەش تاکە هۆکارە بۆ زاڵبوون بەسەر ڕێنووسدا بەتایبەت لە بابەتی ئینگلیزیو عەرەبیدا، هەروەها یاریدەدەرێکی بەهێزە بۆ لەبەرکردن.

١٤- لە هەر تاقیکردنەوەیەکدا تێفکرینو بەراوردکردن لە نێوان پرسیارەکانو نمرەکاندا بەهێمنیو لەسەر خۆیی، نەك پەلە پەلو لە کۆڵکردنەوە.

١٥- ڕوونکردنەوەی پێویست بەدارشتنێکی جوانو دروستو ڕەچاوکردنی یاسای خاڵبەندیو نووسین، بە وەڵامێکی گونجاوو مانابەخش، زانیاریی زیاترو دەوڵەمەندکردنی وەڵامەکەت بەهەر شتێك وابەستە بێت بە پرسیارەکە باشترە.

١٦- بەشێوەیەك بڕوانە پرسیار وابزانە مامۆستایەکیتو شیکاری پرسیارەکە بۆ چەند قوتابیەك دەکەی، تێبگەن بەشێوەیەکی ڕوونو ئاسان.

١٧- وەڵامی هەر پرسیارێکت نەزانی بەپێی تواناو شارەزایی خۆت شتێکی لێ بدوێ، تەنانەت ڕستەیەك، یان دوو ڕستە، وشەیەك، یان دووشەش بێت، بەهەر شێوەیەك بوو بێت.



# هیچ کات لە نرخی کارە باشەکانی مرۆڤەکان کەم مەکەنەوە

بوشرا ئەبوبەکر

لەو گوندەی کە شیڤانای دانا ژیانی تێدا بەسەر دەبرد، پیاوێکی بیرهەڵکەن هەبوو کە لەگەڵ دوو کوڕەکەیدا بیریان بۆ خەڵکی هەڵدەکەندو کارەکانیان بێ کەمو کورتی ئەنجام دەدا، هەموو ئەوانەی کە لەلایەن ئەم سێ کەسەوە بیریان بۆ هەڵکەندرابوو لە کارەکەیان ڕازیبوونو وەسفیان دەکردن، ئەوانیش بەو داهاتەی لەو کارەوە دەستیان دەکەوت ژیانیان بە سەردەبرد.

ژمارەی خوێندکارەکانی شیڤانا ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیاد بووندا بوو، بە جۆرێك ناچاربوو بیر لە درووستکردنی خوێندنگەیەکی گەورە بکاتەوە، خوێندنگەیەکی نوێو گەورەیان بنیاتنا. خوێندنگە نوێیەکە؛ چونکە لەبەشی خوارەوەی گوندەکە دوور لە ماڵەکان بنیاتنرابوو، هیچ کانیو بیرێکی دیکەی لە دەور نەبوو، پێویستی بە بیرێك هەبوو، بۆ ئەم مەبەستەش داوایان لە بیر هەڵکەنو دوو کوڕەکەی کرد کە بیرێکیان بۆ هەڵبکەننو لەسەر نرخەکەشی ڕێککەوتن کە ١٠ لیرەبوو.

بیرهەڵکەنەکان دەستیان بەکاری خۆیان کرد، وەکو خوی هەمیشەییان لە کاتی کارکردندا بە دەنگی بەرز ئاوازییان دەچڕیو شیعرییان دەخوێندەوەو گاڵتەیان لەگەڵ یەکدیدا دەکرد، تێبینی ئەوەیان نەدەکرد کە ئێرە شوێنی خوێندنەو ئەگەری هەیە خوێندکارەکان بێزاربن. بەڵێ ئەو دەنگە دەنگەی ئەوان بووە هۆی بێزارکردنی هەندێك لە خوێندکارەکان، خوێندکارەکان پاش تەواوبوونی بیرەکە بەسەرکەوتوویی، لیستێکی نارەزاییان درووستکرد کە هەموو کارە نادرووستەکانی بیر هەڵکەنو دوو کوڕەکەیان تێدا نووسیبوو، داوایان لە شیڤانا کرد کە لەبەر ئەو کارانەیان لە کرێکەیان کەم بکاتەوە. دواتر شیڤانا لەبەرامبەر هەمووان بە ڕێزەوە سوپاسی بیرهەڵکەنو کوڕەکانی کرد، بۆ ئەو بیرە باشو بێ کەمو کورتییەی کە هەڵیان کەندووە، دواتر لیستی نارەزایو داواکاری خوێندکارەکانی خوێندەوەو گوتی: وەك لەسەری ڕێك کەوتبووین لەبەرامبەر کارەکەتان فەرموون ئەم ١٠ لیرەیە وەربگرن ئەمە مافی خۆتانە؛ چونکە بە جوانیو بە ڕێكوپێکیو بە دڵسۆزی کارەکاتان ئەنجام داوە، ئەم ٣ لیرەیەشتان وەك پاداشت پێ دەدەم؛ چونکە لە کاتی خۆیدا کارەکەتان تەواو کردووە، شایەنی پاداشتی دیکەیش بوون، بەڵام لەبەر گلەیو نارەزایی خوێندکارەکانم لە هەندێك کردارتان پاداشتی دیکەتان پێنادەم، ئارەزووم لەشساغیتانە..

ئێوە ئێستا دەتوانن بڕۆن پشوی خۆتان وەربگرن، دڵنیام ماندوون، پاش تەواوبوونی شیڤانا لە قسەکردن بیر هەڵکەنو کوڕەکانی بەڕێزەوە داوای لێبوردنییان کرد لەسەر کارە نادرووستەکانییانو ڕۆیشتن.

خوێندکارەکان بە دەنگی بەرز نارەزاییان دەربڕیو گوتیان: ئەمە دادپەروەرانە نییە، دەبوایە تەنانەت پارەی کەمترتان پێ بدانایە، نەك پاداشتیشیان پێبدەیت! شیڤانا بە سەرسوڕمانەوە گوتی: ئێرە خوێندنگەی ئەدەبو ڕەفتاری درووستە، دواتر زانستو زانیاری، ئێمە لێرە پاداشتی کاری باش بە جیا دەدەینو سزای کاری نادرووستیش بە جیا دەدەینو هیچ کات ئەو دوانە تێکەڵ ناکەین، ئەوان لە بەرامبەر کارە باشەکانیاندا پاداشتێکی باشیان وەرگرتو لە بەرامبەر کارە نادرووستەکانییان هیچ پاداشتێکییان وەرنەگرت، بەم سادەییە، فێرببن کە لە ژیانتاندا بەهەمان شێوە بڕیار لەسەر مرۆڤەکان بدەن، هیچ کات کاری باشو خراپی مرۆڤەکان تێکەڵ بەیەکدی مەکەن، گەر دەتانەوێت دادپەروەرانە ڕەفتار بکەن لە ژیانتاندا، هیچ کات لە نرخی کارە باشەکانی مرۆڤەکان کەم مەکەنەوە، بەهۆی هەندێك هەڵەی بچووکەوە، هێندە کاری باش قورسو بێ نرخ مەکەن، کە کاری خراپ ئاساییو ئاسان بێتەوە، ئێوە دەبێت ببنە نموونەی کەسانی نەرموونیانو لێبوردە، ئەگەرنا زانستەکەتان نە خزمەتی خۆتان دەکات، نەخزمەتی خەڵك.

Sarchaw: nmakstan site



نووسینی: بیژەنی ئەسەدیپوور

# تەنزی خێزانی

وەرگێڕانی: سەروەر عومەر

* نووسەرێکی گەورە کە دونیای داگیرکردبوو، دواجار نەیتوانی ماڵەکەی خۆی داگیربکات.

* دایک لایلایە بۆ منداڵەکەی دەکات، سەعاتی سەر دیوارەکە خەوی لێدەکەوێت.

* دایک، منداڵەکەی دەباتە دەرەوە، بووکەڵەکە هەست بە خەمی تەنیایی دەکات.

* لە سەر شەقام منداڵەکە بووکەڵەیەک نیشانی دایکی دەدات، دایک باس لە بەتاڵیی جزدانەکەی بۆ منداڵەکەی دەکات. کاتێک دایکو منداڵەکە درێژە بە ڕێگەکەی خۆیان دەدەن، دڵۆپە فرمێسکێک لە گۆشەی چاوی بووکەڵەکەدا دەردەکەوێت.

* منداڵەکە ڕۆژ بە ڕۆژ گەورەتر دەبێت، بووکەڵەکە لە منداڵیدا پیر دەبێت.

* منداڵەکە لەسەر فەرشەکە ڕادەکشێت، گوڵەکانی سەر فەرشەکە منداڵەکە لەسەر دەست بەرز دەکەنەوە.

* منداڵەکە لە ماڵ دەچێتە دەرەوە، خانووەکە حەملەکەی دادەنێت.

* منداڵەکە لە تەنیشت بووکەڵەکەیەوە خەوی لێدەکەوێت. بووکەڵەکە لە خۆشیدا خەوی لێدەزڕێت.

* ژنەکە منداڵی دەبێت، بووکەڵەکە ئاهەنگی لەدایکبوون بۆخۆی دەگێڕێت.

* ژنەکە کاتێک دێتە ماڵەوە پیاوەکە خەوتووە، پیاوەکە کاتێک دەچێتە دەرەوە ژنەکە لە خەودایە. منداڵەکە لە ژێر بەتانییەکەوە بە سەرسووڕمانەوە لەم ڕووداوە دەڕوانێت.

* باوکەکە منداڵەکە بە هاوشێوەی خۆی دەزانێت، دایکەکە پێی وایە منداڵەکەی لە خۆی دەچێت. منداڵەکەی خۆی بە هاوشێوەی بووکەڵەکەی دەزانێت.

* منداڵەکە ڕۆژ بە ڕۆژ گەورەتر دەبێت، دایکو باوکەکە لە منداڵەکەیاندا بە کوشت دەچن.

* ئەندامانی خێزانەکە درەنگ لە خەو هەڵدەستن، ژوورەکە خەونی ڕۆژهەڵاتن لە بیر دەباتەوە.

* ئەندامانی خێزانەکە لە چواردەوری خوانەکە دادەنیشن. خوێدانەکە دانیشتنەکە بەتام دەکات.

* کچەکە لەسەر فەرشەکە دادەنیشێت، گوڵستانی ڤاڵییەکە گوڵ دەردەکات.

* کچەکە سەر گۆناکانی خۆی سوور دەکات، جوانیی بڵێسە دەدات.

* لە ڕۆژانی بارانبارینا، سێبەرەکەم ئیزن دەدەم.

* پیاوەکە لە سەفەر بۆ ماڵەوە دەگەڕێتەوە، شەقامەکە بە بنبەست دەگات.

* ژنەکە ژوورەکە گسک دەدات، گوڵەپاییزییەکان ڤاڵییەکە بەجێ دەهێڵن.

* ژنەکە شووشەی پەنجەرەکان خاوێن دەکاتەوە، شووشەکان لە هەوادا خۆیان دەشارنەوە.

* ژنەکە پەنجەرەی ژوورەکە والآ دەکات، ژوورەکە

هەناسەیەکی ئاسوودەیی هەڵدەکێشێت.

* ژنەکە بۆ شت کڕین لە ماڵ دەچێتە دەرەوە. چێشتخانەکە لێوەکانی دەلێسێتەوە.

* ژنەکە لە چێشتخانەکەدا سەوزە ورد دەکات، بەهار لە ژێر زەبری چەقۆدا دەکوژرێت.

* ژنەکە لە خەمی ئازیزانیدا فرمێسک دەڕێژێت، کلینێکسەکە نقووم دەبێت.

* ژنەکە سەرقاڵی چنینە، زستان لەبەر خۆیەوە هەڵدەلەرزێت.

* ژنەکە بەرگ دەدوورێت، کراس لەدایك دەبێت.

* پیاوەکە بەیانی زوو لە خەو هەڵدەستێت. چاوەکانی پیاوەکە زووتر لە خۆر هەڵدێن.

* پیاوەکە درەنگ لە خەو هەڵدەستێت. چەرپاکە لە ماندوێتیدا خەوی لێدەکەوێت.

* پیاوەکە بە پەلە لەماڵ دەچێتە دەرەوە. ماڵەکە بە خێرایی پیاوەکە بەجێ دەهێڵێت.

* پیاوەکە جگەرەکەی بە چەرخ دادەگیرسێنێت، جگەرەکە لە دەست ژیانی ئامێریی دەناڵێنێت.

* پیاوەکە درەنگ بۆ ماڵ دەگەڕێتەوە، پەنجەرەی ژووری نووستن چاو لەسەر شەقامەکە هەڵناگرێت.

* پیاوەکە قسەکانی خۆی بە ڕاست دەزانێت. ژنەکە گوتەکانی خۆی بە ڕاست دادەنێت. لاپەڕەی ڕووداوەکانی ڕۆژنامە دادوەریی هەردوو لا لە ئەستۆ دەگرێت.

* دزەکە بە ئەسپایی دەچێتە ناو ماڵەکەوە. دایەگەورە شووشەی تەمەنی خۆی دەشارێتەوە.

* پیرەمێرد چاویلکەکەی لە چاو دادەنێ، نیگای پیرەمێرد دەکەوێتە بەر پێیەکانی.

* پیرەمێردە ماندووەکە لەسەر کورسیی پارکەکە پشوو دەدات. ماندوێتیی پیرەمێردەکە، کەمەری کورسییەکە دەشکێنێت.

* پیرەمێردەکە لەسەر کورسیی پارکەکە دادەنیشێت. گەڵای پاییز دێت بۆ دیداری.

* بەر لە هاتنی داربڕەکە، تەنیایی کەمەری درەختە تاقانەکە دەشکێنێت.

* خۆر ئاوا دەبێت. دایەگەورە بە نیگەرانییەوە بە شوێن سێبەرەکەیدا دەگەڕێت.

* دایەگەورە چاویلکەکەی لە چاو دەکات. چاویلکەکە هیچ شوێنێك نابینێت.

* دایەگەورە لە تەنیشت چەرپاکەوە وەنەوز دەدات. مەرگ لە پشت چەرپاکەوە خۆی مەڵاس داوە.

* دایەگەورە لەسەر چەرپای نەخۆشخانە کەوتووە. ئامێری دڵۆپێنەرەکە بۆی دەگری.

* دایەگەورە لەسەر چەرپاکە گیانی سپاردووە. وێنەی گەنجێتی دایەگەورە لە نێو چوارچێوەکەدا پەژموورده دەبێت.



# من
## پشت بەتۆ
## دەبەستم

خاوەنی تەواوی چیاکان، ئەی خاوەنی هەموو باشیەکانی بوون، دەمەوێ لەناخی شکستەوە، بەوپەڕی ڕێزمەوە، بێمە خزمەتتو خۆم شکۆدار بکەم.

خودایە دەزانم دەزانی، بەڵام چێژی گێڕانەوەی ئازار بۆ کەسێ کە چارەسەری بەدەست بێت، زۆر زۆرە. خودایە سوپاست دەکەم، کە منت بەبەندەیی خۆت قبووڵ فەرمووە، بێگومان هەموو بەندایەتییەکی پاك، تۆی لاپەسەندە، چون گەر خاوەنەکەت تاکو تەنها بێت، ئاسوودەیی مانای ئاسمان دەگەیەنێت.

پەروەردگارم، تۆ کە هەموو سەرکەوتنەکانی دونیات بەدەستە، سوپاس، کە شکستت بەمن ڕەوا فەرمووە، خودایەگیان، ئێستا کەپاییزی منە، زۆر هەڵەم گەر وا بیربکەمەوە، گوڵ بوون سەرکەوتنە. من پشت بە تۆ دەبەستم، دەزانم بەهارم زۆر نزیکە، دەزانم ڕۆژێك دێت؛ بۆئەوەی بەندەکانت سەرکەون، یەك کاژمێر، دەکەیە دە کاژمێر، کاتەکان هێندە بەبەرەکەت دەکەیت، کە لە بانگی بەیانی تا سپێدە، دەتوانن شاکار ئەنجام بدەن.

خودایی گەورە فێرمان بکە، تا وەك بەندە مەزنەکانی پێشوو، بەرامبەر شکۆداریت بەڕێز بین، کارێکمان فێر بکە، کە شەیتان لێمان بترسێت، فریشتەکان شەرمەمان لێبکەن.

خودایە، کاتێك کە خۆری کەسێك ئاوا دەکەیت، هەزاران ئەستێرەی پێدەبەخشیت، لە ئاست زانستو میهرەبانیت، هەموو سکاڵاکانم لەگۆڕ دەنێم، تا فێر دەبم بەملکەچییەوە نوێژت بۆ بکەم، هەموو خەیاڵەکانم هەڵدەواسم بە داری لای کارێزەکەی باپیرمەوە، گشت خەونەکانم، لەبن منارەی مزگەوتی ناو باخەکە دەبەستمەوە، بەپشتیوانی تۆوە، ڕێگە نادەم جگە لەخۆمو دڵم، هیچ شتێکی دیکە بێتە خزمەتت. دڵم دێنم؛ تا لەنزیکەوە بە نوورت ئاشنا بێت، هەموو هەینییەك، بۆنخۆشی دەکەمو دەینێرمە مەدینە، با هێندە ڕێبکات، تا تەواوی کتێبە مەزنەکەت جێبەجێ دەکات. ئەی پادشای پادشاکانی هەموو بوون، یارمەتیی دڵم بدە. بگاتە کێوی عەرەفە؛ تا ببێت بە یەکێك لەو دڵانەی کە تۆ شانازی پێوە دەکەیت.

سایە سەرگەتی

# خەم و خەفەت

بێگەرد فارس



پیاوێکی بەتەمەن، خێزانەکەی وەفاتی کردبوو، زۆر خەمبارو نیگەران بوو بۆی، بەشێوەیەك کاری تێ کردبوو، خەمو خەفەتی لەناو شاردا، ناوبانگی دەرکردبوو، هەربۆیە یەکێك لە هاوڕێی خێزانەکەی؛ بۆئەوەی باری سەرشانی سووك بکات، نامەیەکی بۆ دەنێرێتو دەڵێت:

سڵاوی خودای گەورەت لێبێت..

من (...) هاوڕێی خێزانی کۆچکردووتم، خودای گەورە لێی خۆش بێت، بەبیستنی هەواڵی مردنی خێزانەکەت زۆر نیگەران بووم، نیگەرانیو غەمی تۆش، ناوشاری پڕ کردووە، تۆ یەکەم کەسو کۆتا کەس نیت، خۆشەویستت لە دەست دابێت، بە هەزاران کەس باوك، یان دایك، کچ، یان کوڕ....هتدیان لەدەست داوە، بەڵام هەرگیز بەو شێوەیە، خۆیان گیرۆدە نەکردووە، من دەمەوێت چیرۆکی ژیانی خۆمت بۆ باس بکەم، ئەوسا بڕیار بدە، بزانە ڕای خۆت دەگۆڕیت، یاخود نا، چیرۆکی من لە ئێوارەی ٢٧ ڕەمەزانی ١٤٣١ دەست پێدەکات، هەموو خێزانەکەمان ژمارەمان هەشت کەس بوو، باوکمو دایکمو خوشکو براکانم بڕیارمان دا، عەمرە بکەین، قەدەری خودای گەورەبوو، براکانم نەچوونە ناو ئۆتۆمبێلی خۆیان، هەموو بەیەکەوە لەناو یەك ئۆتۆمبێلدا بووین، هەریەکەمان قورئانێکی پیرۆزی بەدەستەوە بوو دەیخوێند، وەك ئەوەی ئەمە کۆتا جار بێت بیخوێنین، دەمانویست هەتا دەگەینە ئەوێ، قورئان بخوێنینەوە، خوشکەکانم دەگریانو دوعایان دەکرد، منیش لێم پرسین بۆچی دەگرین؟ یەکێکیان گوتی: هەستێکی سەیرم هەیە، وا دەزانم ئەمە کۆتا سەفەرمان بێت! لەو ساتەدا وا بزانم، باوکم خەوبردبوویەوە سەیارەکە وەرگەڕا لە شوێنێکی زۆر بەرزەوەو کەوتینە ناو دۆڵێکەوە، لەکاتی ڕووداوەکەدا، بانگی ئێوارەی دەداو هەموو بەڕۆژوو بووین، لە کاتی کەوتنەخوارەوەماندا، من بەهۆی درەختێکەوە گیرسامەوە، بەڵام سەرجەم خێزانەکەم کەوتنە خوارەوە، خوێنێکی زۆرم لەبەر ڕۆیشتو بوورامەوە، بیرمە کاتێك هاتمەوە هۆش، خۆم هاوارم دەکردو بە دوایاندا دەگەڕام، هەرچەندە بریندار بووبوومو شکانم هەبوو، هەندێجار بە پێو هەندێکی دی بە گاگۆڵکێ دەڕۆیشتم؛ بۆئەوەی بیاندۆزمەوە، کاتێك گەیشتمە لایانو دۆزیمنەوە، ویستم خوشکەکانم دابپۆشم، بەداخەوە هەموو گیانیان دەرچووبوو، پەنجەی شایەتمانیان بەرز کردبوەوە، وردە وردە تاریکایی ئاسمانی دادەپۆشی، لە تاریکیو دەنگی ئاژەڵەکان زۆر دەترسام، هەرچەندە گەڕام براکانمم نەدۆزییەوە، زیاتر بەرەو قووڵایی دۆڵەکە ڕۆیشتم دایکمم دۆزییەوە، ئەویش گیانی دەرچووبوو، باوەشم پیاکردو بانگم دەکرد، بەڵام سوودی نەبوو، گەیشتمە لای باوکیشم زۆر دڵخۆش بووم؛ چونکە ئەو زیندوو بوو، لەخۆشیدا باوەشم پێداکرد، هەستم کرد تووشی خوێن بەربوون بووە، پێی گوتم: ئاگات لەخۆت بێت، زۆر لێرە مەمێنەرەوە، بچۆرە سەرەوەو کەسێك بانگ بکە بۆ یارمەتیی دایکتو خوشکو براکانت، لەو کاتەدا لە ترسی دەنگی ئاژەڵو تاریکییەکە توند باوەشم کرد بەباوکمداو بەجێم نەدەهێشت، گوتم خوێنم لێدەڕوات، ناتوانم بجووڵێم، توند لە ئامێزی گرتمو گوتی: کچەکەم هەمیشە لەسەر ئەو ڕێگەیە بە، کە لەسەری پەروەردەم کردوویت، دوعای بۆ دەکردم، گوێم لێبوو شایەتمانی هێناو گیانی دەرچوو، بە تەنیا مامەوەو دەستم بەگریان کردو دەپاڕامەوە تا بێهۆش بووم!

بۆ ڕۆژی دووەم عەسر هێشتا کەس ئێمەی نەدیبوو، شوانێك بەوێدا تێپەڕی بوو، بەفریاکەوتنی ڕاگەیاندبوو، ئەوانیش هەموومانیان لەو شوێنە دەرهێنابوو، منیش بۆ ماوەی پێنج مانگ لە نەخۆشخانە بێهۆش بووم!

لە دەستدانی یەکە یەکەی ئەندامانی خێزانەکەم لەبەردەم خۆمدا، زۆر بەئازارو ناڕەحەت بوو، بەڵام هەرگیز نائومێد نەبوومو ڕازی بووم بە قەدەری خودا، بێ هیچ گلەییو گازندەیەك.

هیوادارم تۆش سوود لەم بەسەرهاتەی ئێمە وەربگریتو بە قەدەری خودا ڕازی بیتو واز لە خەمخواردن بهێنیت.

# هاوڕێی هەمیشەیی



سوڵتان دیار

لەشارۆچکەیەکی بچووک خێزانێکی تابڵێی هەژار هەبوو. وەلێ لێوانلێو بوون لە خۆشەویستی بۆ یەکدیو ڕێزگرتنی یەکدی، ئەم خێزانە بەختەوەرە پێکهاتبوون لە ژنو مێردێکو کچو کوڕێک، ئەم دوو هاوسەرە هەرگیز لەبەر چاوی منداڵەکانیان کێشەو گرفتەکانیان باس نەدەکرد، هەمیشە لەبەرچاوی جگەرگۆشەکانیان، خۆشەویستیو ڕێزو وەفایان بۆ یەکدی دەردەبڕی. ئەرێ جگەرگۆشەکانیشیان ئاوێنەی دایکو باوکە بەڕێزەکەیان بوون.

شەوێ لە کاتی دانیشتنو خواردنی نانی ئێوارەدا، کە سفرەیەکی هەژارانە بوو لەخواردنی خۆش، بەڵام دەوڵەمەند بوو لە خۆشبەختیو قەناعەتی دڵەکانیان. کچە ڕووی کردە باوکیو گوتی بابەگیان ئەها پرچە جوانەکەم ناشیرین بووە دەتوانی شانەیەکم بۆ بکڕیت؛ تا قژمی پێدابێنمو هەمیشە جوان بمێنێتەوە؟ لەم کاتەدا برابچووکەکەشی گوتی: بابەگیان منیش سەعاتەکەم قایشەکەی خراپ بووە، دەتوانی قایشێک بۆ سەعاتەکەی منیش بکڕیت، وەلێ باوکی هەژار بەخەندەیەکی فرمێسکاویو دڵی پڕخەمەوە، دوای ماچکردنی ڕوومەتە ناسکەکانیان، گوتی: ببوورن ئازیزەکانم، ئێستا توانام نییە. منداڵەکانیش بەخەندەیەکەوە گوتیان: بابەگیان خەم مەخۆ گرنگ نییە، دڵخۆشیمان بە سەعاتو شانە نییە. ئەو شەوە خوشکو براکە، تا درەنگان لەناو جێگەدا بیریان لەیەکدی دەکردەوە، هەریەکەو لە خەیاڵی ئەوەدابوو چۆن ئەوی دیکەیان دڵخۆش بکاتو ئاواتەکەی بهێنێتە دی، کچە دەیگوت: چۆن قایشی برا بچووکەکەم بکڕم، براکەشی بیری دەکردەوە چۆن شانەیەک بۆ قژی دادەم بکڕم، تا خەو بووە سوڵتانو چاوەکانی لێکنان، بەیانی لەگەڵ خواردنی نانی بەیانی کچە چووە قوتابخانەو براکەشی بەرەو قوتابخانەکەی خۆی، بەڵام لەپاش قوتابخانە کچە چووە لای قژ کڕێکو گوتی: دەمەوێ قژم بفرۆشم کە قژەی پیشانی کڕیاردا گوتی قژت زۆرجوانە حەیفە مەیبڕە. بەڵام کچە کە لەدایکو باوکیەوە فێری قوربانیدان ببوو، گوتی نا سوپاس بەڕێزم پێویستم پێی نییە، دەمەوێ قژم بفرۆشم کچە قژی فرۆشتو ڕۆیشتە لای سەعاتسازێکو قایشێکی سەعاتی بۆ براکەی کڕی، دواتر بەقژێکی کورتەوە گەڕایەوە ماڵ، براکەشی لەپاش قوتابخانە خۆی گەیاندە بازاڕی شارۆچکەکەو چووە فرۆشگای سەعاتێک، سەعاتەکەی کە سەعاتێکی زۆر جوان بوو فرۆشتی بەبڕێک پارەو لەپاش کڕینی شانەیەک گەڕایەوە ماڵەوە، بەڵام بینی خوشکەکەی بەقژێکی کورتەوە لەبەر دەرگا چاوەڕێیەتیو قایشی سەعاتێکیش وابەدەستییەوە، لەم کاتەدا فرمێسک لەچاوی هەردووکیان دایکردە بارانو یەکیان لەئامێز گرت، بۆ ئەوە نا کارەکەیان بەفیڕۆ چووبێو شتێکی گرنگی ژیانیان لەدەست دابێت، بەڵکو لەبەر خۆشیی ئەوەی کە هەریەکەیان زانی هاوڕێی هەمیشەیی چەندە دڵسۆزیەتی. خۆشەویستی واتا قوربانیدان، خۆشەویستیی ڕاستەقینە بەم جۆرە دەبێت!

ئەهلی دونیا، چی لە جوانی تۆ دەزانن؟! لەکوێوە بتناسن، چۆن پەی بە گەورەییت بەرن، ئەوان لە زمانی نیگاو پەیامی ڕۆحو سروودی دڵ، چی دەزانن؟!

تۆ ئەو کەسەی کاتێك هەموو، تەماشای دەستم دەکەن، تۆ تەماشای دڵم دەکەی..!

کاتێك بە زمان لەگەڵم دەدوێن، تۆ بە ڕۆح دەمدوێنی!

کێ وەکو تۆ، باوەشی گەرمی میهرو ئەوینی بۆ کردمەوە؟

لە سۆزی دڵو ئاوازی ناخو چرپەی ڕۆحم تێگەیشتو بە دڵی گوێی بۆ گرتم؟!

تۆ دەستت گرتم بۆ نێو گوڵزاری مەحەببەتو لەسەر دەریای ئەوینی پاك، ژوانت لەگەڵ ڕۆحمدا بەست!

تۆ منت بردە سەر گەنجینەیەك، ئیدی گاڵتەم بە هەموو زێڕوزیوی دونیا دەهات!

چونکە کاتێك مرۆڤ، بە مەحبووبی خۆی دەگات، ئیدی ڕۆح لە چی کەمە؟! کێ لەو کەسە گەورەترە، کە شازادەی مەملەکەتی ئەوین، بۆ مەملەکەتەکەی، پێشوازی لێ دەکات!

گەرمیانی



# شازادەی مەملەکەتی ئەوین

شازادەیەك، كە بۆ تۆ، هەناسەو لێدانی دڵو سۆمای چاوو هێزی ئەژنۆو پشتوپەناو كەسوكارو موڵكو سەروەتو سەروماڵو عێلو عەشرەتە!

شازادەیەك، كە پاكترە لە نمەی بارانو كرێوەی بەفرو ئەسرینی شەونم!

مامۆستایەك، كە لە خزمەتیدا، وانەی عیشق دەخوێنیو بە مرۆڤبوونی خۆت شاد دەبیتەوە!

بە زمانی ئاوریشم، لێو دەخاتە سەر دڵت!

بە بۆنی هەناسەی، گوڵاوپرژێنی سینگت دەكاتو ئیدی تا ئەبەد، بۆنی ئەوین دەگری!

لەوێدا، بە سیمایەك ئاشنا دەبی، وەكو پەڕەی كتێبێكی ئاسمانی، دڵۆپ دڵۆپ، نووری لێ دەتكێ!

لەوێدا، ئاوازێك دەژنەفی، لە سروودو دروودی فریشتە دەچێ!

لەوێدا ڕۆح، دەگاتە زیندەگیی حەقیقیو ئاسوودەیی بێسنوور!

لەوێدا، خەندەیەك كەمەندكێشت دەكا، زۆر لە كازیوە، ئەفسووناویتر!

لە دنیایەكدا دەژی، پاكتر لە دنیای منداڵی!

پرووشەی سۆزێك دەبارێتە نێو ناخت، وەك سۆزی دایك!

لەگەڵ كۆترە سپییەكاندا، دەفڕی بۆ بەرزایی ئاسمان!

ڕۆژانە بە ئاوی گوڵاوو شەونمی نێرگزو عەبیری فیردەوس، دڵو ڕوخسارت بسمیل دەكەی!

ئیدی تۆ دەبیتە ئەو!

لە خۆتدا، ئەو دەبینیو لە ئەودا، خۆت!

هەناسەكانت بۆنی ئەویان لێ دێو وشەكانت تامی ئەویان گرتووە!

ئیدی كە خۆری ئەو هەڵدێ، تۆ دەتوێیتەوە!

تۆ كە دەركەوتی، مەپرسە: چی بەسەر دێ، جانو دڵ
حاڵەتی شەونم تەماشا كە، بە وەقتی ڕۆژهەڵات -مەحوی-

ئیدی دەروازەی كۆشكی شازادە، دەبێتە ژوانت، خۆڵی ئەو دەرگایە، دەبێتە سورمەی چاوو ساتێكی ئەو شوێنە، دەبێتە لەزەتی جەننەتی ڕۆح!

تا وەفایی لەو دەرە بێتو بچێ، مەنعی مەكە
سورمەی خاكی دەرت، بۆ چاوی پڕئەسرین دەبا

ئیدی پەردەی غەفڵەت لەسەر دیدەت لا دەبرێو بەجوانییەك ئاشنا دەبیت، كە تەنها لە بەهەشت دەچێت!

لێرەدا، دەزانی كە جگە لە پەیوەندیی دڵو ئاوێتەبوونی ڕۆح، هەموو پەیوەندییەكانی دی كاتین!

ئەو كاتە ئەم ڕاستییە دەزانی، كە وانەی ئەوینت خوێندووەو لە مانای ئەوینو خۆشەویستی، باش تێگەیشتووی!

ئەو كاتەی یادی ئەو، بەهەشتو دووریو هیجرانی ئەو، دەبێتە دۆزەخ!

یادی تۆ، بۆ من وەكو چی: وەك بەهەشت
هیجری تۆ، بۆ من وەكو چی: وەك سەقەر -نالی-

هەموو بەیانییەك، لەخەو هەڵدەستیو ڕادەكەی بۆ لای ئەو، خەونەكانی بۆ دەگێڕیتەوە!

چونكە خەونەكانیشت، هەر هی ئەون!

من چیم هەیە لەم دونیایەدا، جگە لە تۆ شازادەكەم، جا چیم نییە، كە تۆم هەبێ!

كێ هەیە لە من دەوڵەمەندتر بێ؟!

كەسێ، خاوەنی دەوڵەتی دڵو ئاسمانی عیشقو گوڵزاری ئەوینو خۆشەویستی بێ، دەبێ لە چیی كەم بێ؟! ئیدی چاوەڕوانی چی بكات؟!

بێ تۆ، من نە هیچ بووەو نە هیچم هەبوو! وەلێ ئەمڕۆ، تۆ بۆ من، هەموو شتێكی! سەرچاوەی هەموو جوانییەكانی منی، گەیشتن بە تۆ، گەیشتنە بە یەقین!

گەیشتن بە مەملەكەتی تۆ، گەیشتنە بە دەڤەری عەفافو پاكیزەییو دنیای فریشتە!

شازادەكەم، ئیدی من، موڵكی تۆم!

چۆن باران، موڵكی خاكو گوڵەباخ موڵكی بەهارو مانگ موڵكی ئاسمانە، ئاواش من هی تۆم! دەستم دامێنت، لە دیداری خۆت مەحرووومم نەكەی!!

قوربان، وەرە سەیرێكی دڵو عالەمی دڵ كە
هەر زەوقە بە دڵ، شەوقە لەسەر، ئاهە لە دەمدا -وەفایی-

حافزی شیرازی دەڵێ: جگە لە عیشق، ڕێگایەكی دی، بۆ ڕزگاربوونی مرۆڤ نییە!

منیش جگە لەو ڕێگایەم نەگرت، هێدی هێدی دێم بەرەو لای تۆ، ئەی ئەمینداری دڵم!

جگە لە ئاواتی توانەوە لە تۆدا، هیچ ئاواتێكم نییە.

لە هەموو شتێ بێئاگام، لە هەموو ترسێ بێپەروام، تەنها وێڵی ئەو شوێنەم، كە تۆی لێیت؛ چونكە تۆ لە هەرشوێنێ بیت، ئەو شوێنە فیردەوسە!

بە هەر ڕێگایەكا گوزەر بكەی، بە بۆنی هەناسەت دەتدۆزمەوە، لەهەر شەوێكدا وەدەركەوی، بە نووری سیمات دەتناسمەوە!

بۆ من، جگە لە تۆ، كەس دەناسم؟!

دەسووتێم، بەو سووتانە، بەڵكو شایانی گەیشتن بم بە تۆ، بەڵكو بە شاگردو موریدی خۆت، قبووڵم بفەرمووی!

سەراسەر كاری سالم عیشقی تۆیە، ئەوەڵو ئاخر
خەجاڵەت بێ قیامەت، گەر بەبێ تۆ، مەیلی جەننەت كا



# نامە نوورییەکان

## نامەی چل و چوار

ماموٚستا، لە گێژاوی ئەم سەردەمە دژوارەدا، کە مرۆڤەکان ڕۆژبەڕۆژ، هەموو ڕێزو بەهایەك، دوابەدوای یەك لەدەست دەدەنو خۆیان لەنێو گێژەڵۆکەی سەرگەردانیدا نوقم دەکەن، باوەڕدار هەست بە چێژی ئیمانوبەرزیو بڵندیی ژیان دەکا لە سایەی بەرنامەکەی خودادا!

چی جیهانێکی سەیرە، کاتێك دەچیتە سەر بەرماڵو ڕۆحت بەرەو عەرشی مەزنو مەلەکووتی ئەعلا هەڵدەکشێ؟!

چی سەعادەتو خۆشیو لەزەتێکە، کە دڵ لە تاوا، دێتە لەرزینو چاو ئەسرینی خۆشی دەڕێژێو ناخ دێتە سەما!

لەوێدا، هەست بە لەزەتێك دەکەی، کە بە هەموو موڵکو سەروەتی دونیا، سەودا ناکرێ!

کاتێك بەندەکان، وەشوێن بەندەی وەکو خۆیاندا ڕادەکەنو دڵیان، بە مەتاعی دنیای فانی خۆش دەکەنو فرمێسك، بۆ خۆشییە سەرابئاساکانی دنیای فانی دەڕێژن، تۆش دڵت ئاوێزانی نووری خوداییەو ڕۆحت لە کووچەو کۆڵانی بەهەشتا دێتو دەچێ!

کاتێك مرۆڤەکان، ڕێگای ڕاستیان ون کردووەو سەریان لێ شێواوە، تۆش بە ڕاستە شەقامی «مستقیم»دا، بەرەو لای خوداوەند، هەنگاو دەنێی!

ئەو کاتەی پەڵەی ڕەشی تاوان، ڕووناکی ڕوخسارەکان دەدزێو تەپوتۆزی فەسادو فیتنە، نێوچەوانەکان گرژ دەکا!

تەماشای ڕوخساری نوورینی ئەهلی ئیمان کە، ئەوسا دەزانی مەحرروومان لە نوور، جەند بەستەزمانن!!

﴿وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُورًا فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ﴾ النور: ٤٠

چی بڵێم، ماوٚستای خۆشەویستم: لە سوپاسی خودایەکدا، کە دەستی گرتین بۆسەر ڕێگای نوور، چاوانی ڕشتین بە کلی فەرموودەکانی، سیمای سپی کردین بە سوژدەبردن بۆ جەمالو جەلالی! چی بڵێم خودایە، تۆ نەبای، من ئێستا لە کام تاریکستاندا، پەلەقاژەم دەکرد؟!

ئازیزی من، مرۆڤ هەرگیز ناتوانێ سوپاسی خودای گەورە بکات لەسەر نیعمەتی ئیمان؛ چونکە ئەوە، تەنها خەڵاتێکی خودایيو ئیختیارێکی ئیلاهییە!

خودا بە لوتفو میهرو خۆشەویستیی خۆی، لەنێو بەندەکانیدا، کەسانێك هەڵدەبژێرێو نووری ئیمان دەخاتە نێو دڵیان، ئەم کارەش بەخودا نەبێت، بە کەس ناکرێت، تەنانەت بە خۆشەویسترین بەندەی خوداش!!

ئەی نابینی: پــەروەردگار، بە پێغەمبەری نازدار دەفەرموێ:
﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ﴾ القصص: ٥٦

کەواتە: تۆ بە ویستی خوداوەند، نێوت هەڵبژێرا، بۆ نێو ڕیزی کاروانی نوور! هەڵگرانی چرا، دراوسێکانی خودا لە بەهەشتا!

ئای ئەم ئیختیارە، چەند گەورەیە!

مــرۆڤ سەرسـام دەکا! خاوەنی ئەم خەڵاتــە لە کوێیەو بیر لەچی دەکاتەوەو چۆن دەژیو چاوەڕوانی چی دەکات!!

بۆ چەند ساتێك، چاوەکانت لێك نێ!

با بەدڵ گەشتێك بکەین بۆ هەزاران ساڵ پێش ئێستا!

خەڵکــی بە ئاواتی ئەوەن، دەســتیان لە دامێنی «فیرعەون» گیر بێ، غوڵامی بەر دەرگاکەی بن، بەڵام بزانین خێزانەکەی چی دەڵێ؟ چی داوا دەکا؟ دڵی بە کێوە پەیوەستە؟!

﴿ رَبِّ ابْنِ لِي عِندَكَ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ ﴾ التحريم: ١١

بێئاگا لە کۆشــكو تەلاری فیرعەون! لە نازونیعمەتی شاژنی! لە خۆشیو مەتاعی دونیا! دڵ وا لە ئاسمان، ڕۆح وا لە جینان!

چی داوا دەکا لە خۆشەویســتی خــۆی، ماڵێك لەکوێ؟ لەلای خۆی لە بەهەشت، نزیك لە عەرشی خودا!

ئەو ئافرەتە، تەنها لاشەی لە کۆشکی شایە، ڕۆحو جەستە، وەکو پەروانە، لە ئاسمانی حەوتەمن، بەدەوری عەرشا دەخولێنەوە.

لە ماڵ دێمە دەر، ماڵان جێ دێڵم

تا بەنهێنی، ناوی تۆ بێنم مەجنوون ـ

ئازیــزم: دووری لــە خــوداو دەردی غەفڵــەتو مردنی دڵو لەیادچوونی ڕۆژی دواییو ڕاکردنو بەشوێن سەرابی دنیادا، ژیانی حەقیقی، لە مرۆڤەکان سەندووەتەوە!

ئــەوان تەنها وەکــو گیانلەبەرێك زیندەگی دەکەن، هیچی دی نا!

حەیاتــی حەقیقی، ژیانی ڕاستــەقینە، تەنهــا لای هەڵگرانی مەشخەڵی نوورە!

﴿ أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا ﴾ الأنعام: ١٢٢

ئایا کەســێك، کە بێگیان لە گومراییدا، سەرلێشــێواوو داماو بــوو، بەڵام دڵمان بە ئیمان زیندوو کــردەوەو هیدایەتمان دا بۆ نووری ئیلاهیو ڕێگای ڕاســتی پەیامبەران، وەکو ئەو کەسە وایە، کە لەنێو تاریکســتانی گومراییــدا، پەلەقاژە دەکاتو ناتوانێ لێی دەرباز بێت؟!

ئەهلــی حەیاتــی حەقیقی ئازیــزم وەکو ئیمامــی هەرەوی دەفەرموێت، بە سێ هەناسە دەژین:

١. هەناســەی تــرس: لە خــودا، هەیبــەت لە پــەروەردگار، پەیوەســتبوونی دڵ بــە فەرمانــی ئەو خــودا گەورەیــەو یادی ئاخیرەتو ڕۆژی دادگای ئیلاهی.

٢. هەناســەی هیواو ئومێدو ڕەجا: بە تەماشــاکردنی بەڵێنی خــوداو خەڵاتی ڕۆژی دوایی، بۆ باوەڕدارانو گوزەرکردن بە ڕۆح، لەنێو باخو گوڵزاری بێوێنەی بەهەشتدا!

٣. هەناســەی خۆشەویســتیی خودا: بە ئاشــنابوون بە ناوی جــوانو ســیفاتی بــەرزی ئیلاهــی بــە لێوانلێوبوونــی دڵ، بە خۆشویستیو جەماڵی خودایيو بەرزیو بڵندیو هێزو دەسەڵاتو میهرو بەزەیی بۆ بەندەکانی.

کاتێك گوناهەکانی دەکەوێتە یاد، هەناسەی ترس هەڵدەکێشێ!

کاتێك بەزەیــیو میهری خــوداو بەخشــندەییو لێبوردەیی بێسنووری خودایی دێتەوە یاد، هەناسەی ڕەجا هەڵدەکێشێ!

کاتێکیــش جــەلالو جەمــاڵو کەمــاڵو ئیحســانو فەیــزی بێکەوشــەنی خودایــی دێتــەوە یــاد، هەناســەی خۆشەویســتی هەڵدەکێشێ!

ئــەم هەناســانەش، ترازووی ئیمانن، بــا ئیمانی خۆمانی پێ بکێشین!!

پلەیەك لە ســەرووی ئەم حەیاتــەش، حەیاتی کۆبوونەوەی ڕۆح، لەبــەر دەســتی خــودادا، بەشــێوەیەك وەکو ئاســیە، هیچ خەمێکی نییە، جگە لە گەیشتن بە خودا.

هەناسەکانی ئەم ژیانەش، هەر سیانن:

١. هەناسەی ئاتاج بە خودا: بەشێوەیەك کە هیوایەکت ببڕێ، تەنها بە خودا نەبێ! بە ڕۆحو دڵو لاشــە، تەنها موحتاجی خودا بیت!

جگــە لە خــودا ڕوو نەکەیتە کەسو ڕازونیــازو تکاو ڕجات، نەخەیتە بەر دەستی کەس!

٢. هەناسەی هەژاری بۆ لای خودا: بەشێوەیەك تەنها خۆت بە هەژاری بەر دەرگای ئەو بزانیت، ئەمەش لوتکەی دەوڵەمەندییە!

﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنتُمُ الْفُقَرَاءُ إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ ﴾ فاطر: ١٥

ئــەوەی تــۆ داوای لــێ دەکەی جگــە لە خودا، هــەژاری لای خودایــەو هــەر داوا لە خــودا دەکا، ئەوەی داوای بەخشــینی لێ دەکەی، هەر دەبێ خودا پێی ببەخشێ!

کەواتــە: دەوڵەمەندتریــن کەس، ئەو کەســەیە، کــە تەنها هەژاری لای خودا بێو لە بەردەستی خودادا نەبێ، هەرگیز خۆی بە هەژار نازانێ!

٣. هەناســەی شــانازیو ئیفتیخار: کاتێك باوەڕدار، هەســت بــە قوربــی ئیلاهیو هۆگربوون بە جــەلالو جەمالی دەکاو دڵی پڕ دەبێ لە خۆشــیو ســروورو ســەعادەت، هەناســەی شــانازی هەڵدەمژێو لە خۆشیدا، شا بە سەپان ناگرێ.

وَمِمَّـا زَادَنِي شَرَفًـا وَتِيهًـا ... وَكِـدْتُ بِأَخْمُصِـي أَطَـأُ الثُّرَيَّـا
دُخُـولِي تَحْتَ قَوْلِـكَ: يَا عِبَـادِي ... وَأَنْ صَـيَّرْتَ أَحْمَـدَ لِي نَبِيًّا

جــا جگە لەم ژیانە، ئیدی ژیان هەیــە؟! ئەوەی ئاوا، لەگەڵ خودادا نەژی، ژیانی هەس؟! یان مردووەو بەشی زیندوو دەخوا! ڕاســتی بۆ خوداوەند، کە دەفەرمــوێ: ﴿ أَمْوَاتٌ غَيْرُ أَحْيَاءٍ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴾ النحل: ٢١

ئەوانە مردووی بێ گیانن، ناشزانن کەی زیندوو دەبنەوە!

چاومان لــە دەرگای خودایەو بەئومێدی ئەو ژیانە بەرزەین، خودا بە لوتفی خۆت، لەو نوورە، مەحرووممان مەکەو لەو ژیانە، بێبەریمان مەکە!

ع.ش.شێرکۆ



# لەگەڵ «شێخ ڕەئووف»ی شاعیردا

شاعیر ناوی شێخ ڕەئووفی کوڕی شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەعرووفی نێرگزەجارییە، ساڵی ١٩٣٢، لە گوندی ئەحمەد بڕندە لەدایك بووە.

شاعیر کەسێکی نیشتمانپەروەرو خوداناسو داناو قسەخۆشو شاعیرێکی بەهرەمەندو بەسەلیقە بووە. وێڕای شیعرەکانی خۆی، کۆمەڵێك شیعری جوانی لە شیعرەکانی حافزی شیرازی، بەشێوەیەکی نایاب، وەرگێڕاوەتە سەر زمانی شیرینی کوردی.

شاعیر ساڵی ١٩٨٨، بە نەخۆشی کۆچی دوایی کردووەو هەر لە گوندی ئەحمەد بڕندە، بەخاك سپێردراوە.

ئەمەش نمونەیەکە لە شیعرەکانی:

### دنیاپەرستی

پایەو سامانی دنیا هەنگوینە
لەمیش شیرینتر، باشەو ڕێی دینە
ئەوەندەش چوویتە لیتەی پارەوە
دەخنکێی، دەپسێی لەژێر بارەوە
وەك هەنگ کە نیشتە ناو هەنگوینەکەی
پەلوپۆی ئەشکێو دەرباز نابێ لێی
مرۆڤیش هەروا، کەوتە ناو دنیا
دەیان بیرو مەیل، ئابڵووقەی ئەیا
وەك تەیری چاپۆك، کە داو بیگرێ
تا زۆر بجووڵێ، زووتر ئەخنکێ
کە دینی بەرداو دنیاش خنکانی
لەم لا بێبەشەو لەو پەشیمانی

*** ***

### حەکیمیی خوا

یەکێ چووبێتە ناو ماڵی خواوە
دەستی بردبێ بۆ قوڵفی کاوە
یەکێکیش لەناو مەیخانە مەست بێ
بە زەهری بادە، زەلیلو مەست بێ
گەر ئەو دەربکا، کێ وەری ئەگرێ
با لەم ببوورێ، کێ بەری ئەگرێ
کە مادام وایە، خاوەن بیروهەست
یاس مەبە لەدەست تاوانبارو مەست
بەدیهێنەری هەردوو لا خوایە
تۆ وایتو ئەو وا حیکمەتی تیایە
ئەگەر ناتەوێ ئاڵوگۆڕی کەی
خۆت قورسو ئەو سووك تەماشا ناکەی

پەندەکانی شێخ ڕەئووفی شاعیر

بەوە دڵخۆش بە، کە لێت بپچڕن
نەك پارەت پێدەن، مەردیت لێ بکڕن

*** ***

بە سەروەت دینو دونیا نەسێنی
تۆوی بەخشینو چاکە نەچێنی
بیری زۆربوونی ئەتکا نۆکەری
هەر پاسی کەیتو سوجدەی بۆ بەری

*** ***

هەرگیزنەنازێ ئەو کەسەی ژیرە
بە پایەی بەرزی باوكو باپیرە
ڕوونە وەك خۆرو گشت ئەیسەلمێنێ
(باوك مەلەوان)، ئاو ئەیخنکێنێ
هونەر بنوێنە، نەك زێڕو گەوهەر
گوڵ لە دڕکوداڵ، خەلیل لە ئازەر